حول تطبيق الشريعة

زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی 54

محمد قطب

# دەربارەی جێبەجێکردنی شەریعەت

وەرگێڕانی
سوهام بەدرزنجی

التفسير

# مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەری لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە ، ئازادکردنیان لە گشت کۆت و بەند و بۆچوونە تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و ڕەوتگەرایی .
- بناغەیەک بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد ، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکارییانەی هەبێ ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە .

دەگەڵ ڕێز و تەقدیرمان بۆ بیر و ڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە ، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەموو بیر و بۆچوونەکانیان بین .

با دەستوورێشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت :

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

# دەربارەی
# جێبەجێکردنی
# شەریعەت

نوسینی

**محمد قطب**

وەرگێڕانی

**سوهام بەرزنجی**

ناوی کتێب به عەرەبی: حول تطبيق الشريعة

ناوی کتێب به کوردی: دەربارەی به جێ بەجێکردنی شەریعەت

نووسینی: محمد قطب

وەرگێڕانی: سهام بەرزنجی

بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە

نەخشەسازیی وبەرگ: أمين مخلص

نۆره و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٤ك – ٢٠١٣ز

تیراژ: ١٥٠٠ دانه

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانه گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی ( ٧٣٢ ) ساڵی ٢٠١٣ پێدراوه





نوسینگەی تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس

Mob:00964 750 460 51 22

Tel: 0964 750 25 18 138

www.tafseer-pub.com

tafseeroffice@yahoo.com

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾

## بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی چاپی دووەم

(سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی رێنمایی کردین و هیدایەتی داین کە گەر ئەو نەبایە لە هیدایەت کراوان نەبووین)

پێش ماوەیەکی زۆرکەم پێشەکی چاپی یەکەمی ئەم پەرتووکەم نووسی، ئێستاش ئەوەتا پێشەکی چاپی دووەمتان پێشکەش دەکەم، ئەمەش فەزڵ و بەرەکەتی فراوانی خوای گەورەیە، سوپاسگوزارم و داوای یارمەتی و سەرکەوتنی زیاتری لێ دەکەم.

بەدەمەوەهاتنی زۆر بۆ خوێندنەوەی ئەم کتێبە و هاوشێوەکانی نیشاندەرێکی زۆر روونی هەیە لای من، بەوەی بابەتی جێ بەجێکردنی شەریعەت بۆتە جێگای گرنگی پێدانی زیاتر لە لایەن ژمارەیەکی زۆری خەڵك بە تایبەتی گەنجان ئەمەش بەڵگەیەو هیچ گومانێك هەڵناگرێت.

سروشتی ئەم کارە وایە کە ئەوەشمان نابێت لە یاد بچێت جێ بەجێکردنی کرداریی شەریعەت زەمینەسازی ئەم ئوممەتەی بۆ ئەم کارە مەزنە پێویستە تا لە ئاستی ئەودا بێت و، بتوانێت جێ کەوتەکانی لە ئەستۆ بگرێت و، یەکەمین هەنگاوی ئەم زەمینەسازییەش دروستکردنی بناغە-قاعدەیەکی پتەوە کە لەپێداچوونەوە-تعقیب-ی کۆتایی دوا لاپەرەکانی ئەم کتێبەدا ئاماژەم بۆ کردووەو، دەڵێم ئەمە ئەرکە زۆر گرنگەکەی سەرشانی بانگەوازخوازانی ئەمڕۆیە، لە بابەتی دیکەو زۆر شوێنی کتێبەکانی پێشتریشمدا ئەوەم روونکردۆتەوە کە زۆر پێویستە ئەو کارە لە ئاستێکی بەهێزو پتەودا بێت و، تەنها لە پێناوی خوداو ئامادەکاری بۆ تێکۆشان لەبەر خوداو، ئەو پەڕی بەرچاو روونانەو دووربینیەوە بێت، بە جۆرێك لە پاکێتیەکەیدا ئیسلام

بنوێنێت و هەر ڕووداوێکی لە ناوکاو ڕوویدا لە ئەستۆی بگرێت، بە هەنگاوی جێگیرەوە بە نێو ڕووداوەکاندا گوزەر بکات.

ئەوەی لە هەمانکاتدا گومانی تێدا نیە ئەوەیە، زۆر بوونی گرنگیدان بەبابەتی شەریعەت لای خەڵکانێکی زۆر بەتایبەتی گەنجان، نیشانەیەکی پرشنگداری ڕێگایەو، هێمایە بۆ ئەو خێرەی کە بەرێوەیەو ئێمەش لەسەر ڕێگایین بەرەو رووی.

خودای باڵا دەست سەرفرازمان بکات بۆ ئەو کارەی کە خۆشی دەوێت و پێی رازیە...

**محمد قطب**

# پێشەکی

هەر کاتێ باس لە جێ بەجێکردنی شەریعەت بکرێ، لێرەو لەوێ دەنگی نارەزایەتی بەرز دەبێتەوەو، دەیکەنە هەراو رەتی دەکەنەوە، وەك ئەوەی جێ بەجێکردنی شەریعەت کارەسات و بەڵایەك بێت و وڵاتی موسڵمانان بگرێتەوە، یان وەك ئەوەی بیرکردنەوە لەو کارە، کارێکی گێلانە بێت و بە مێشکی هیچ کەسێکی عاقڵدا نەیەت!

ئێستا؟ لە سەدەی بیستدا؟ پاش ئەو هەموو پێشکەوتنانەی جیهان بەخۆیەوە بینی؟ دوای ئەوەی بەهۆی هۆکارە نوێیەکانی گەیاندنەوە ، جیهان بووە گوندێکی بچوك، بواری ئەوەنیە بڕیاری پۆشینی کاڵایەکی جیاواز لە کاڵای ئەوانی دیکە بدەیت؟!

ئایا دەتانەوێت خۆمان لەو خەڵکە جیابکەینەوە؟!

دەتانەوێت بەرەوپاش بگەڕێینەوە؟ یان رەوڕەوەی پێشکەوتن ڕابگرین؟!
یاخود دەمانەوێت لەهەموو جیهان دابڕێین و بەسەر خۆماندا بکەوین؟

ئەم هەموو ماندووبونە بۆ؟ چی وامان لێدەکات بەرەو ئەو ڕێگە دژوارە بڕۆین؟.

ئایا تەنها لەبەر ئەوەی کە موسڵمانین. یەکەم تەنها وتنی لا الە الله الا الله محمد رسول الله بەسە بۆ ئەوەی ببینە موسڵمان؟! ئێوە شتانێك دادەهێنن کە لە دینی خوادا نیە! چونکە موسڵمانێتی بە وتنی وشەی شەهادەت دەچەسپێت، ئیدی بابەتی شەریعەت ئەوە لە شتە گۆڕاوەکانە کە فەرمانڕەوا(ولی امر) بە پێی تێروانینی خۆی بۆ پێویستی باردۆخ هەڵس و کەوتی تێدا دەکات! بارودۆخیش ئێستا روونە بۆ هەموو کەسێکی خاوەن هەست کە بۆ ئەوە دەست نادات! ئایا کەمینەکانتان لە یاد چووە؟ چۆن

شەریعەت لە وڵاتدا جێ بەجێ بکەین لە کاتێدا کەمینەی ناموسڵمانمان لەگەڵ دەژی؟

ئەی وڵاتە زلهێزەکانتان لەبیرکردووە کە هەڵوێستیان چۆنە بەرانبەر ئیسلام؟ بە تایبەت تێروانیین سەبارەت بە جێ بەجێکردنی شەریعەت؟ ئایا ئەو توانایەمان هەیە ئێمەی بێ دەسەڵات لەسەر زەوی کە بەرەنگاری وڵاتانی زلهێز ببینەوە پێی؟!

بۆیە بیرکردنەوە لە جێ بەجێکردنی شەریعەت لەم کاتەدا بیرکردنەوەیەکی(نابەرپرسانەیە)! کەسانێك بانگەشەی بۆ دەکەن کە بەعەقڵی خۆیان لەم واقیعە مێژووییەی دەوروبەریاندا نازین! بەڵام هۆشمەندان(بەرپرسان) ئەوانەی خۆیان لەوە دەبوێرن بەو جۆرە بیر بکەنەوەو بەدانایی و بەرچاو روونی بەرەو رووی واقیع دەبنەوەو تێروانینێکی واقعیان هەیە بۆ کاروبارەکان!

بەمجۆرە هەرکە باسی جێ بەجێکردنی شەریعەت بکرێتەوە هات و هاواریان بەرزدەبێتەوە! ئەوەش هات و هاواری ئەو کەسانەیە لە ناخی خۆیاندا دۆڕاون، ئەوانەی کە هەژمونی فکری عەقڵ و گیانی خواردووەو کردونیەتە کەرەستەیەکی گۆڕاوی بێ کەڵك کە بۆ هیچ شتێك دەست نادات! ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيۡنِ أَحَدُهُمَآ أَبۡكَمُ لَا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوۡلَىٰهُ أَيۡنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأۡتِ بِخَيۡرٍ هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ وَمَن يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾[1].

جگە لەم کتێبە[2] پێشتر لە جێگای تردا ئەو هۆکارانەم شی کردۆتەوە کە

---

(١) سورەتی(النحل:٧٦).

(٢) بڕوانە(واقعنا المعاصر) بەشی(خطر الانحراف) و بەشی(اثار الانحراف).

بۆتە هۆی ئەوەی موسڵمانان بە غەزوویی فکری رازی بن و، وایکردووە ئەم غەزووە لەبۆچوونی(رۆشنبیراندا) بە تایبەت ئەوانەی عەقڵ و دەرونیان وا گۆش کراوە تا ببنە شوێنکەوتەی رۆژئاواو دروشمەکانی ئەوان دەڵێنەوەو، بە زمانی ئەو دەدوێن و کاروبارەکان بەپێی تێروانینی ئەو لێ دەروانن و، بونەتە جێ نیشینی(خەلیفە) لەسەر خاکی ئیسلامی ئەو کاتانەی بارودۆخ ناچاری دەکات سەربازەکانی بکێشێتەوە، کە سەردەمانێك وڵاتانی موسڵمانیان پێ ملکەچ کردبوو، جا ئەو شوێن کەوتەییە درێژەی دەبێت بێ ئەوەی کە خەڵکی سەربازە شاراوەکانی ببینێت کە وڵاتەکەیان دەخاتە ژێر رکێفی رۆژئاوا!.

بەم خێراییە باس لەو هۆکارانە ناکەین کە بۆتە هۆی فەراهەم هاتنی ئەو شێوایە لەسەر خاکی موسڵمانان و، بەرپرسیاریەتی خودی ئوممەتی ئیسلامی لەوەی بەدەستی دوژمنەکانی بەسەری هاتووە ئەو کاتەی پەیامەکەی لە یاد کردو پشتی کردە جێ بەجێکردنی.

لێرەدا بە کورتی و پوختی، بەشێوەیەکی بابەتیانە باس لە گرنگترین ئەو تێروانینانە دەکەین کە سەری پێ لە خەڵکی دەشێوێنن تا ئاوایان نیشان بدەن کە جێ بەجێکردنی شەریعەت کارێکە ناکرێت ئەمرۆ بەدی بێت، تەنانەت نابێت بەدی بێت ئەگەرچی لە تواناشدا بێت! ئەمە جگە لەوەی ئەوە کارێکەو ئێستا پێویست نیە لە کاتێکدا ئیسلامەکەمان بە وتنی لا اله الا الله بەدی بێت!.

هەر لە سەرەتاوە زوو باسی بابەتی عەقیدەو شەریعەتم تاوتوێ کردوە، کە ئایا دوو شتی لێك جیاوازن لە دینی خوادا بە جۆرێ بتوانین موسڵمان بین و شەریعەت جێ بەجێ نەکەین؟ لەگەڵ بابەتی سەربەستی فەرمانڕەوا لە راگرتنی کار بە شەریعەتی خوا، یان هەموار کردن و گۆڕینی، پاشان لە گومانی دژیەکی جێ بەجێکردنی شەریعەت لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی سەردەم و یەکنەگرتنەوەی ئەحکامەکانی شەریعەت خۆی لەگەڵ پێویستیەکانی

شارستانیەتی سەردەم و، گومانی نەتوانینی جێ بەجێکردنی شەریعەت بەهۆی هەبوونی کەمینە ناموسڵمانەکان لە جیهانی ئیسلامی و، نەکرانی جێ بەجێکردنی بە هۆی هەڵوێستی وڵاتانی زلهێز بەرامبەر ئیسلام دواوم.

لە خوای گەورە داواکارم ئەم کارە بە پەلەیەم سوودی هەبێت و هەمووومان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانە سەرفراز بکات کە خۆشی دەوێت و پێی رازیە.

﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾(١).

---

(١) سورەتی هود(٨٨).

زۆر کەس لەژێر کاریگەری هزری دواکەوتوو لە لایەك و، کاریگەری هزری داگیرکەرانە لە لایەکی دیکە وا دادەنێت کە وتنی(لا اله الا الله محمد رسول الله) خەسڵەتی موسڵمانیەتی تا لە ژیاندا ماوە دەبەخشێتە مرۆڤ و، لەدوا رۆژیشدا بەهۆیەوە دەچێتە بەهەشت، ئیدی کاروکردەوەو گوفتارو رەفتاری و بیرکردنەوەو هەستەکانی بە هەر جۆرێك بێت، هیچ کام لەو کارانە پەیوەندار نیە بە جێ بەجێکردنی شەریعەتی خوا..!

هەندێکی دیکە لە خەڵك کە خۆیان بە شارەزاتر لە ئاینی خوادا دەزانن وای دەبینن دەربڕینی وتەی شەهادەت خەسڵەتی موسڵمانێتی لە دونیادا دەبەخشێتە مرۆڤ و پێوەی نوساوە بە درێژایی ژیانی، ئیدی کارو کردەوەو بیرکردنەوەو هەستەکانی هەرچۆنێك بێت لێپێچینەوەی لە رۆژی دواییدایە لای خودا دەینێرێتە بەهەشت یان بۆ دۆزەخ بەپێی ئاگاداری خوای گەورە لە کارەکانی بە شاراوەو ئاشکرایەوە، بەڵام ئێمە رووکەشەکەیمان بۆ هەیە رووکەشیش گوتنی(لا اله الا الله)یە... ئەمەش هیچ پەیوەندییەکی بە فەرمانڕەوایی شەریعەتی خواوە نیە!

بۆ وەڵام دانەوەی ئەوانە، شەڕ کردنی ئەبوبەکر(رەزای خوای لێ بێ) لە دژی کەسانێك کە گوتەی شەهادەشیان دەوت و نوێژیشیان دەکرد بەڵام وازیان هێنابوو لە زەکات دان، خۆگەر خەسڵەتی موسڵمانەتی بە وتنی شەهادەت بە مرۆڤەوە بلکێت ئیدی کاروکردەوەی هەر چۆن بێت کێشە نەبێت، ئەوا رێگا بە ئەبوبەکر نەدەدرا لە دژی ئەو کەسانە بجەنگێت و هاوەڵانیش(رەزای خوایان لێ بێت) لەسەر پێویست بوونی کۆنەدەبوونەوە، پاش ئەوەی کەدڵنیابوون ئەوە فەرمانی خوایە لەو کارەدا(١).

گوتنی(لا اله الا الله محمد رسول الله) دەروازەی خەڵکە بۆ چوونە ناو

ئیسلام، جگە لەمە دەروازەیەکی تریان نیە بۆ چوونە ناوی و بەس تەنها بە گوتنی بە موسڵمان دادەنرێت.

بەڵام ئەو کێشەی ئەوان لێی بێ ئاگان- یان خۆیان لێ بێ ئاگاکردووە- ئەوەیە کە خەسڵەتی موسڵمان بوون لە خۆڕاو تەنها بە گوتنی وشەی شەهادەت نالکێت بە مرۆڤەوە، ئیدی کارو کردەوەی بە هەر جۆرێك بێت، بەڵکو پێویستی بە کۆششێکی بەردەوام هەیە کە مرۆڤ ئەنجامی بدات لە هەر چرکە ساتێك لە چرکەساتەکانی تەمەنیدا تا لە شوێنی خۆیدا جێگیری بکات و، رێگری ئەوەی لێ بکات لێی بکەوێتە خوارەوە، ئەمەش خۆی لە ئەنجامدانی کردەوەکاندا دەبینێتەوە کە دڵ و بەشەکانی مرۆڤ تێیدا بەشدارە، چونکە ئەوە لە پێویستیەکانی ئیمانە، هەروەها ئەنجام نەدانی چەند کارێکی دیاریکراوی دڵ و دەست و قاچەکانی چونکە(لا اله الا الله)کەی هەڵدەوەشێنێتەوە بنچینەی ئیمان هێنانەکەشی کەم دەکات.

لەمەشدا کۆششی هاوەڵان(رەزای خوایان لێ بێت) لە ژیانی خۆیاندا بەردەوام بوو بە مەبەستی هێشتنەوەی خەسڵەتی ئیسلامەتی تێیانداو، لە ترسی ئەوەی ئەم خەسڵەتەیان لە دەست بچێت، لەمەشدا گەیشتنە ئەو ترۆپکە جوانانەی کە شایانی ئەوەن لە پێناویدا بە چاکترین سەردەم بناسرێن[١] بەڵام ئەوەی لێرەدا جێگەی پەند لێ وەرگرتنە ئەوەیە کە ئەوان هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبوون بە تەنها گوتنی(اشهد ان لا اله الا الله محمد رسول الله) بەس بێت بۆ ئەوەی خەسڵەتی ئیسلامیەتیان پێوە بمێنێتەوە بەبێ ئەو کۆششە بەردەوامەی کە بە مەبەستی جێگیربوونی ئەنجامیان داوە، ئەمەش لە ئەنجامدانی هەندێك کارو خۆ دوورگرتن لە هەندێ کاری دیکەدا رەنگی دەدایەوە تێیاندا.

---

(١) (خير القرون قرني) بوخاری و مسلم هێناویانە.

گەر یەکێکیش بڵێت پەیوەستە بە رۆژی دواییەوە و کاری بەسەر دونیاوە نیە، لە قیامەتیشدا لێپێچینەوەی تایبەتیمان لەگەڵ دەکرێت، خوای گەورە بە ویستی خۆی فەرمانی تێدا دەدات، کەسانێك دەخاتە بەهەشت -گەر ویستی لەسەر بێت- کە هەرگیز کاری چاکەیان ئەنجام نەداوە، کەسانێکیش دەردەهێنێت لە ئاگر -ئەگەر ویستی لەسەر بێت- کە هەرگیز کاری باشیان نەبووە، ئێمە دەمانەوێت قسە لەسەر ژیانی دونیا بکەین حوکمی مرۆڤ پاش وتنی(اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله)... پێیان دەڵێین تەنانەت لە ژیانی دونیاشدا خەسڵەتی ئیسلامەتی لە پاش ووتنی شەهادەت بە درێژایی ژیان لەگەڵ مرۆڤدا بەردەوام نابێت بەبێ ئەنجامدانی هەندێ کارو خۆ دوورگرتن لە هەندێ کاری دیکە، بەچاوپۆشی لەوەی لەناو دڵیایەتی و تەنها خوای گەورە ئاگاداریەتی.

ئێمە لێرەدا بەم پەلە پەلیە ناتوانین لەو کارانە بدوێین کە پێویستە مرۆڤ ئەنجامیان بدات یان خۆی دووربگرێ لێیان هەتا خەسڵەتی ئیسلامەتی پێوە بمێنێت لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، لەزۆر کتێبدا لەوە دواوین[١]

لێرەدا ئێمە گرنگی بەیەك خاڵی دیاریکراو دەدەین، ئەویش پەیوەندی(لا الـه الا الله)یە بە حوکمکردن بە شەریعەتی خوداو رادەی بە تینی ئەو پەیوەندییە، ئایا دەکرێت بیروباوەڕ(عقیدە) لە شەریعەت جیابکرێتەوە لە دینی خوادا.

بەر لەوەی قسە لەسەر ئەم بابەتە بکەین، دەمانەوێت ئاماژە بە مانایەکی دیاریکراو بکەین کە بێ ئاگان لێی ئەو کەسانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە

---

(١) ئەگەر ویستت لەسەری بوو سەیری بەشی(لا اله الا الله) لە کتێبی(مفاهيم ينبغى أن تصحح) وبەشی(الصحوة الاسلامية)ی کتێبی(واقعنا المعاصر) بکەن.

تەنها گوتنی شەهادە بە تەنیا خەسڵەتی موسڵمانیەتی لە دونیـادا دەیەخشێ و بڕوا پێهێنان(تصدیق) و بڕیار لەسەردانی(إقرار) بە تەنیا لە قیامەتـدا خـەڵك دەبەنە بەهەشت، پاساویش بەو(جەهەننەمیانە) دەهێننـەوە کە خـوای گـەورە لە ئاگر دەریان دەهێنێت پاش ئەوەی هێندەی خوای گەورە بڕیاری لەسـەرە لـە ئاگردا هێشتراونەتەوە، پاشان بە تکای پێغەمبـەری خـوا(صلی الله علیـه وسـلم) دەخرێنە بەهەشت، لە کاتێکدا کە هەرگیز کارێکی باشیان ئەنجام نەداوە.

لێرەدا دەڵێین- هەروەکو لە کتێبی پێشتریشدا گووتوومانە-[1]، فەزڵی خـوای گەورە ناڕەحەت بوونی تێدا نیە، ﴿يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦ﴾[2] بەڵام ئەمـەش مەرجی خۆی هەیە، بەرەهایی نیە وەك کەسانێك گومان دەبـەن! خـوای گـەورە ئەو مەرجانە دیاری دەکات، با نمونەی ئەمە بـە لیژنـەکانی بـەزەیی بهێنینـەوە لە تاقیکردنەوەکاندا -نمونەی باڵاش هەر بۆ خودایـە- لیژنـەی بـەزەیی سـەیری کاغەزی ئەو کەسانە دەکات کە چوونەتە تاقیکردنـەوەو دەرنەچوون، جا گـەر کەسێك لەسەر دەستی لیژنەی بەزەیی دەرچوو ئەمە ئەو واتایە ناگەیەنێت کـە ئـەو کەسـە بـەپێی پێـوەرە پـەیڕەوکراوەکان پێشتر نەکـەوتبێت، پاشـان ئـەوان دەبێت ئامادەی تاقیـکردنەوەکە بووبن و پاشان کەوتبن، چونکە کـاری لیژنەکـە ئەوانـە ناگرێتـەوە کـە بـەهۆی قۆپیـەو فـرت و فێڵـەوە لـە تاقیکردنەوەکـە وەدەرنـراون، بـەزەیی خـوای گـەورەش بەهـەمان شـێوەیە﴿وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾[3].

ئەوانـە دەگرێتـەوە کـە لـە ئەنجامـدانی کارەکانـدا کەمتەرخـەم بـوون کـە

---

(١) (مفاهيم ينبغي ان تصحح) بەشی(مفهوم لا اله الا الله)

(٢) سورەتی الانسان(٣١).

(٣) سورەتی الروم(٢٧).

ئــەوانیش بــڕوادارن(مؤمنــون)، ئــەو کەســانە ناگرێتــەوە کــە بــەهۆی هــاوەڵ بریاردانەوە لە بەزەیی خوا وەدەرنراون لەبەر ئەم فەرمایشتەی خودا﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾(١).

ئێستاش بـا سـەیری ئـەو هـاوەڵ بریاردانـە بکـەین کـە بەهۆیـەوە مـرۆڤ لـە بازنەی لێخۆشبوون وەدەردەنرێت و رێی بەهەشتی لێ دەگیرێت.

خـــوای گـــەورە لـــە قورئانـــە نێردراوەکـــەی و ســـوننەتەکانی پێغەمبەرەکەیدا(صلی الله علیه وسلم) روونی کردۆتەوە کـە هاوبـەش بڕیـاردان سێ جۆری سەرەکی هەیـە، هـەر یەکـەیان هاوبـەش بڕیاردانـە، هـەر یەکەشـیان هەڵوەشێنەرەوەی یان ناتەواویە لەو(لا اله الا الله)یەی گوتوویەتی:-

یەکەم: پەیوەنداره بە بیروباوەڕەوە، کە ئەویش باوەڕ بوونە بە خواوەندێك کە لەگەڵ خوادا هاوبەشە لە چاکەو خراپەدا یـان لـە مـردن و زینـدووکردنـەوە یــان بــەڕێوەبردنی کارەکانــدا بەشــدارە لەگــەڵی، یــان بــڕوای بــە هــەبوونی تکاکارانێـك هـەبێت کـە لـە توانایاندایـە تکـای بـۆ بکـەن و فـەرمانی خـوا لـە ئاسمانەکانی زەویدا دەگۆڕێت.

دووەم: پەیوەنداره بە پەرستشەوە، کە ئەویش بریتی یـە لـە ئاراسـتەکردنی هەر رووکارێك لە رووکارەکانی پەرستش بۆ جگە لـە خـوا، ئیـدی لەگـەڵ خـودا دایبنێ یان بەبێ ئەو، وەك پاڕانەوە یان هانـا بـۆ بـردن یـاخود نـەزر بـۆ کـردن یان لە پێناویدا سەربڕین.... و هتد.

ســێ یــەم: پەیوەنــدارە بــە حــەرامکردن و حەڵاڵکردنــەوە(یاســادانان)، بــە شێوەیەکی جیا لەوەی، خوای گەورە بڕیاری لەسەر داوە.

لە کاتێکدا کە ئێمـە بـەمجۆرە بەپەلـەین لـە کارەکەمانـدا، جۆری سێیەمی

---

(١) سورەتی النساء(١١٦).

هاوبــەش بڕیــاردان قســە لەســەر دەکــەین، کــە ئــەویش هاوبــەش بڕیــاردانی یاسادانانە دوور لـەوەی خـوای گـەورە ناردوویـەتی، تـەنها لەمـەیان دەدوێـین و بـەقورئانی پـیرۆز و سـوننەتەکانی پێغەمبەرەکـەی(صـلی الله علیـه وسـلم) و گوتەی زانایان بەڵگەی بۆ دەهێنینەوە.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا روونی دەکاتـەوە کە پێغەمبـەرانی بـەرز و بەرێز -سڵاوی خوای گەورەیان لێ بێت- تەنها بـۆ ئـەوە نـەنێردراون بـۆ خـەڵك کە باوەڕ بهێنن بـەوەی خـودا تـاك و تەنهایـەو هاوبەشـی نیـە، بـەڵکو تـا بۆیـان روون بکەنەوە کە پەرستش و خودا پەرسـتی پێویسـتە تـەنها بـۆ خـودا ئـەنجام بدرێت بـەبێ هاوبـەش بریـاردان، پاشـان ئـەو رێنماییانـەی پـەروەردگاریان پـێ بگەیـەنێت و بەهۆیـەوە ژیـان و مامەڵـەیان لەگـەڵ یـەکتردا پـێ رێـك بخـەن(تـا خـەڵکی بەدادپـەروەری هـەڵس و کـەوت بکـەن):﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ﴾[1].

خـوای گـەورە روونـی دەکاتـەوە کـە ئـەو سـیانە: بیروبـاوەڕو دروشـمەکان و یاساکان پوختەی پەیامی هەر پێغەمبەرێك بـووە بـۆ گەلەکـەی﴿ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾[2].

جا وەلانانی هەریەکێك لەو سیانە یـان هاوبـەش کردنـی جگـە لـە خـودا.... هەڵوەشێنەرەوەی ئیمانە.

لە بارەی هاوبەشی بڕیـاردان لـە یاسا دانانـدا کـە ئێمـە لـەم دەروازەیـەدا لـە بارەیەوە دەدوێین دەفـەرمووێت:﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَا

---

(١) سورەتی الحدید(٢٥).

(٢) سورەتی هود(٥٠).

وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴾(١).

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ﴾(٢).

**هەروەك لە بارەی جولەکەو گاورەکانەوە دەفەرموویێت: کە خوای گەورە پابەندی کردوون بە جێ بەجێکردنی شەریعەتەکەی و سەرپێچی کردنیان لە فەرمانەکەی لە ئیمانداری وەدەریان دەنێت:** ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾(٣).

﴿ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾(٤).

**هەروەها خوای گەورە لە خستنە رووی ئەوەی کە یاسادانان بەدەر لەوەی کە خودا بۆی ناردوون هاوبەش بڕیاردانێکە کە لە ئیمانداری وەدەریان دەنێت**

---

(١) سورەتی لقمان(٢١).

(٢) سورەتی النحل(٣٥).

(٣) سورەتی المائدە(٤٤).

(٤) سورەتی المائدە(٤٦-٤٧).

و روو لە هاوبەش بڕیاردەران دەکات یان دەیدا بە گوێیاندا:﴿ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ﴾[١] ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾[٢] هەر لەمبارەیەوە دەربارەی جولەکەو گاورەکان دەفەرمووێت:﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾[٣].

کاتێك عودەی کوری حاتەم لە خزمەتی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) نکۆڵی لەوەکردو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەیاندەپەرستن! پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) روونی کردەوە بۆی کە بەدانانیان لەسەرووی هەموو شتێکەوە(ارباب) دەرئەنجامی شوێن کەوتنی ئەو یاسایەیە کە بەدەر لەوەی خوا ناردوویەتی دایان ناوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (الم یحلوا لهم الحرام ویحرموا علیهم الحلال فأتبعوهم؟ فذلك عبادتهم ایاهم) [٤].

(واتە: ئایا حەرامیان بۆیان حەڵاڵ نەکردن و حەڵاڵیان لێ حەرام نەکردن و شوێنیان کەوتن؟ دەی ئەوە پەرستشیانە بۆیان). کاتێکیش خوای گەورە ئاینەکەی خۆی لەسەر زەوی جێ کردەوە دەستەی سێ یەم دەرکەوت، جگە لە باوەڕداران و بێ باوەڕانی ئاشکرا، ئەوانیش دوو رووەکانن، کە ئەوانە لە بەشی هەرە خوارەوەی دۆزەخ و ئاگردا دەبن، ئەوانەی کە لە رووکاری دەرەوەدا وەك ئیماندار خۆیان نیشان دەدەن و لە لەناوەخنیشەوە بێ باوەڕن، بێ باوەڕ بوون

---

(١) سورەتی الاعراف(٣).

(٢) سورەتی الشوری(٢١).

(٣) سورەتی التوبە(٣١).

(٤) ترمزی گێراویەتەوە.

و دوو رووبەکەشیان لە بابەتی یاسادانانداا چڕبۆتەوە، خوای گەورە روونی دەکاتەوە کە نارەزایی بوونیان لە شەریعەتی خوداو گەڕانیان بۆ شەریعەتێکی دیکە ئیمانیان بە تێکرایی لێ دادەڕنێ، ئەوانە نابنە بڕوادار تا ئەو شەریعەتانەی بەرەو رووی دەچن وەلانەنێن و بگەڕێنەوە بۆ لای شەریعەتی خودا بە تەنها بەدوور لە شەریعەتەکانی دیکە:﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴾[1].

تا دەگاتە ئەوەی دەفەرموویێت:﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾[2]

﴿ وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ (٤٧) وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴾[3].

جا ئایا ئەم ئایەتانە کە هاوشێوەیان زۆرە لە قورئاندا پەیوەندی شەریعەت بە بیروباوەڕەوە روون بکاتەوە کە لێك دانابڕێن، یاسادانانیش بەدەر لەوەی کە خوای گەورە ناردوویەتی هاوبەش بڕیاردانێکە کەسەکە لە ئوممەت وەدەردەنێت، فەرموودەکانی پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) ئەو

(١) سورەتی النساء(٦٠).

(٢) سورەتی النساو(٦٥).

(٣) سورەتی النور(٤٧-٤٨).

پەیوەندیە بەتینە دەخاتە روو، کاتێك باسی کاروباری خەڵکی دەکات لەوەختی سەرپێچیکردنی شەریعەتی خودادا، بەرونتر ئەو دەمەی کە شەریعەتی خوا وەلا دەنرێ و بە شەریعەتێکی دیکە بەدەر لە شەریعەتی خوا فەرمان دەکەن دەفەرمووێت: (ما من نبي بعثه الله في امة قبلي الا كان له من امته حواريون و اصحاب يأخذون بسنته ويقتدرون بأمره ثم انها تخلف من بعدهم خلوف يقولون مالا يفعلون ويفعون ما لا يؤمرون فمن جاهدهم بيده فهو مؤمن ومن جاهدهم بلسانه فهو مؤمن فمن جاهدهم بقلبه فهو مؤمن وليس وراء ذلك الايمان حبة خردل) [1].

(انه يستعمل عليكم امراء فتعرفون وتنكرون فمن كره فقد برىء ومن انكر فقد سلم ولكن من رضى وتابع) [2].

واتە: هەر پێغەمبەرێك لەو پێغەمبەرانەی خوای گەورە بەر لە من ناردونی ئەوا لە نێو گەلەکەیاندا حەواری و هاوەڵیان هەبووە، سوننەت و کردەوەکانیان وەرگرتووەو کاریان پێ کردووەو شوێنی فەرمانی ئەو کەوتوون، پاش ئەوان وەچەو نەوەیان بەدوادا هاتووە کار بەوە ناکەن کە دەیڵێن بەو جۆرە کار دەکەن کە فەرمانیان پێ نەکراوە، جا هەر کەس بەدەستی جیهاد بکات بڕوادارە، هەر کەس بە زمانی جیهادیان لە دژ بکات بڕوادارە، هەر کەس بە دڵی لە دژیان جیهاد بکات بڕوادارە، بەدەر لەوە هێندەی دەنکە خەردەلێك بڕوا(ئیمان) نیە)).

(فەرمانرەوای وا دەسەڵاتدار دەبن لەسەرەتا دەزانن و ملی پێ نادەن جا ئەوەی پێ ی ناخۆش بێت بێ بەریە، ئەوەش مل نادات سەلامەت دەبێت، بەڵام ئەوەی رازی دەبێت و شوێنی دەکەوێت).

---

(١) اخرجه مسلم

(٢) اخرجه مسلم

پوختـەی هـەردوو فەرمووده‌کـە بریتـی یـە لـەوەی کـە رازی بـوون بـە شەریعەتێك جگە لە شەرعی خوا وەك یاسا کە بەدەرە لە یاسای خـوا کەسـەکە لە ریزی موسڵمانان دەردەچێت.

سـەبارەت بـە گوتـەی زانایـانیش لـە نێوانیانـدا قسـەیەکی(ئـیبن کەسـیر) ـ رەحمـەتی خـوای لـێ بـێ ـ دەهێنینـەوە کـە لـە راڤـەی ئـەم ئایەتـە پـیرۆزەدا کردوویەتی:﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾[١].

دەڵێت: خوای باڵا دەست ئەو کەسەی لە حوکمی خوا دەربچێت رەتی بکات کە گشتگیرەو هەموو چاکەیەکی لەخۆگرتووەو رێگری لە هەموو خراپەیەك دەکات و بەرەو رووی بیروراو زاراوانێکی دیکە بڕوات کە کەسانێك بەبێ گەڕانەوە بۆ شەرعی خوا دایانناوە، هەروەك خەڵکانی سەردەمی نەفامی فەرمانیان پێ دەکرد بە نەفامی و نەزانی، بەوەی کە بەهەواو ئارەزووی خۆیان دایاندەنا، یان وەك چۆن تەتارەکان بە سیاسەتەکانی پادشایی کە لە پادشا جەنگیزخانیانەوە بۆیان ماوەتەوەو ئەو بۆی داناون، کە لە کتێبێکی پڕ فەرمان پێکهاتووەو لە شەریعەتە جیاوازەکانەوە وەرگیراوە؟ لە جولەکەو گاورو میللەتی ئیسلام و جگە لەوان و فەرمانانێکیشی تێدایە کە لە ویست و ئارەزووی خۆی وەریگرتووەو لە نێو خەڵکەکەیدا بۆتە یاساو پێش قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرەکەی(صلی الله علیه وسلم) دەخەن، جا هەر کەس ئەو کارە بکات بێ باوەڕە و پێویستە شەڕی لە دژ بکرێت تا دەگەڕێتەوە سەر حوکمی خوداو پێغەمبەرەکەی، جگە لەو لەشتی گەورە و بچووکدا بە هیچ شتێکی دیکە حوکم نەکات[٢].

---

(١) سورەتی المائدە(٥٠).

(٢) تەفسیری(ابن کثیر) ج٢، ص٦٧.

ئیبن تەیمییە(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: لەوەی باسمکرد سەبارەت بە شەریعەت و حوکمکردن بەشەرع روون دەبێتەوە کە مرۆڤ بۆی نیە لە شەریعەتی خودا دەربچێت، بەڵکو هەموو ئەو شتانەی کە باشن بۆی لە بنەچە(اصول) و نەوە(فروع) و کاروباری و سیاسەت و مامەڵەو شتانی دیکەش هەمووی لە شەرعدا هەیە، جا سوپاس و ستایش بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیان.... و حەقیقەتی شەریعەتیش: شوێن کەوتنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)و گوێرایەڵ بونیان، هەروەها دەرچوون لەوە دەرچوونە لە گوێرایەڵی پێغەمبەران، گوێرایەڵی پێغەمبەرانیش ئاینی خودایە کە فەرمانی کردووە...... دەفەرموێت:﴿ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ وَأَخۡرِجُوهُم مِّنۡ حَيۡثُ أَخۡرَجُوكُمۡۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِيهِۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمۡ فَٱقۡتُلُوهُمۡۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٩٢﴾ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ ﴾.

هەر بۆیە پێویستە لەسەر چاودێرو چاودێری کراو، بەرپرس و خەڵکی ژێر قەڵەم رەو، یان هەموویان گوێرایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی بن، پابەند بن بەو شەریعەتی کە بۆی داناون[1].

شێخ محمد کوڕی عبدالوهاب(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: گومانێکی تریان هەیە و کردوویانەتە بیانوو ئەویش پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کاتێك ئوسامە پیاوەکە دەکوژێ و دەڵێ(لا اله الا الله) سەرکۆنەی دەکات و دەفەرموێ: ئایا پاش ئەوەی وتی(لا اله الا الله) کوشتت؟ هەروەها لە وتەیەکی تردا فەرمووی: من فەرمانم پێ کراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم تاوەکو دەڵێن(لا

---

(١) مجموع فتاوى شيخ الاسلام ابن تيمية، کۆکردنەوەو رێکخستنی(عبدالرحمن بن محمد بن قاسم) ج١٩، ص٣٠٩.

اله الا الله) و، چەندین فەرموودەی تر و ئەوەندە بەسە بۆ ئەوانەی دەیکەنە بڕوبیانووی خۆیان و، مەبەستی ئەو نەفامانە ئەوەیە هەر کەس وای وت ئیتر بێ باوەڕ نابێت و ناکوژرێت با هەرچی دەیەوێت و پێ ی خۆشە بیکات، بەو نەفامانە دەوترێت: ئاشکرایە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ جولەکەدا جەنگاو غەنیمەتی لێ وەرگرتن لە کاتێکدا ئەوان دەیانووت:(لا اله الا الله)، هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ(بەنی حنیفه)دا جەنگان لە کاتێکدا شایەتمانی(لا اله الا الله)یان هێنابوو وە(محمد رسول الله)شیان دەوت و نوێژیان دەکرد و خۆیان بە موسڵمان دەزانی، هەروەها ئەوانەی عەلی کوڕی ئەبی طالیب ئاگری تێبەردان.

ئەو زانایانە دانیان بەوەدا ناوە هەر کەسێك نکۆڵی لە ڕۆژی زیندوو بوونەوە بکات بێ باوەڕ دەبێت و جەنگی لەگەڵ دا دەکرێت ئەگەر بشڵێت(لا اله الا الله)، هەروەها دژی یەکێك لە روکنەکانی ئیسلام بێتەوە بێ باوەڕەو دەکوژرێتەوە ئەگەر(لا اله الا الله)یشی وتبێت، لە کاتێکدا ئەمە ڕەوا بێت ئەگەر دژی لقێکی ڕابوەستێت و شایەتمانەکەی سوودی نەمێنێت بۆی ئیتر چی دەمێنێتەوە بۆی لە کاتێکدا دژ بە یەکتاپەرستی یەکەی بێت و نکۆڵی لێ بکات، لە کاتێکدا لەسەرووی هەموویانەوەیەو بنچینەو بنەمای ئاینی هەموو پێغەمبەرانە؟ ئیتر وتنی(لا اله الا الله) و پەرستشی ڕواڵەتی زۆر و خۆدەرخستنیان بە ئیسلام ئەم کارەیان کە بە ئاشکرا لادانە لە شەریعەتی خودا پاساو نادات و سوودی نامینێت بۆیان(١).

لەگەڵ ئەوەی مەسەلەکە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و بۆچوونی زانایاندا زۆر روون و ئاشکرایە، بەڵام لە لای هەندێ خەڵك

---

(١) کتاب(الجامع الفرید) چاپی دووەم، چەند برگەو هەڵبژاردەیەك لە ل٢٣٢ ول٢٣٣.

ناڕوونی و لێ تێکەڵاوبوونێك دروست دەبێت، تەنانەت لە کتێبەکانی(فقه)ەوە دەیهێنن کەوا ئەوەی حوکم بە شەریعەتی خودا نەکات حوکمی بێ باوەڕی نی یە مەگەر نکۆڵی لێ بکات و دژی بوەستێ، هەروەها ئەم بۆچوونەی ئیبن عەباس دەهێنینەوە دەڵێت: ئەمە ئەو بێ باوەرییە نی یە ئێوە گومانی پێ دەبەن و ئەوە بێ باوەڕ بوون نی یە لە ئایین پێی دەربچێت، بێ باوەڕبوونێکە کافری ناکات(کفر دون کفر)...

لێیان تێکەڵ بووە وا دەزانن مەسەلەی حوکم کردن بە جگە لە شەریعەتی خودا، یاخود رازیبوون بە رێساو یاساکانی جگە لە خودا، هەمان حوکمی هەیەو(کفر دون کفر) کوفرێکە لە ئایین پێی دەرناچێت.

بێگومان را و دیدی زانایان(فقهاء) سەبارەت بە حوکم کردن بە جگە لە شەریعەتی خودا ڕاستەو پێکاویەتی، هەموو کەسێك حوکمی بە جگە لە شەریعەتی خودا کرد بەبێ باوەڕ هەژمار ناکرێت، چونکە لەوانەیە یەکێك لێکدانەوەو تأویلی کردبێت یاخود لەو مەسەلەیە نەزان بووبێت، یاخود پاڵنەرێکی ئارەزووبازانەی هەبووبێت، وەك دادوەرێك بەرتیلی وەرگرتبێت بۆ کێشەکەی بەردەستی و بەهۆی کاریگەربوونی بە بەرتیلەکە سەرپێچی لە حوکمەکەی خودا دەکات و لێرەدا دەبێت بەسەرپێچیکارێکی (فاسق) و پێی بێ باوەڕ نابێت.

چۆن لە بازنەی ئیماندا مایەوە لە کاتێکدا حوکمی بە جگە لەوەی خودا ناردوویەتی کردوویەتی؟ هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرباری ئەوەی لە حوکمی خودا لایداوە سەرپێچی کردنەکەی خۆی نەکردۆتە بریارو حوکم و لە بری شەریعەتی خودا دایناپێت، هەروەها نەیووتووە ئەمە لە بری حوکمی خودا داناوەو بەجێ ترە، یاخود فەزڵی بدات بە سەر حوکمی خودادا و جێگەی شەریعەتی پێ لەق بکات، هەڵوێستەکەی وێنەی دزێك یان زیناکارێك لە

کرداردا سەرپێچی دەکات بەڵام شەریعەتی دابەزیوو ناگۆڕێت و ڕێسایەکی دی لە لای خۆیەوە لە بری شەریعەتی خودا دانانێت.

بەڵام کاتێك کار بە جگە لەوەی خودا ناردوویەتی دەکات و، یاسایەکی تر دادەڕێژێت مەسەلەکە تەواو جیاوازە... ئەو لێرەدا لەلای خۆیەوە شەریعەتێکی دەستکرد دادەڕێژێت و حەڵاڵی دەکات و حەرامی تێدا حەڵاڵ دەکات بەبێ ئەوەی لەو شەریعەتەدا هەبێت کە خودا ناردوویەتی پاشان دەیخاتە پێش شەرعی خوداوە فەزڵی دەدات بە سەریدا، ئەمە بە کۆی رای زانایان هاوبەش پەیدا کردنی گەورەیەو لە ئایین دەردەچێت، چونکە دژایەتی کردنی دانپێدانانی ئەوەیە خودا ناردوویەتی، ئەمەش داوایەکی راستەخۆ ـبەڵکو مانای راستەخۆی ـ(لا اله الا الله)یە.

چۆن وا خۆمان دەردەخەین بڕوامان هێناوە کە(لا اله الا الله)یە واتە هیچ پەرستراوێکمان نی یە جگە لە خودا، هیچ حاکمێك نی یە جگە لە خودا، لە کاتێکدا ئێمە دەڵێین گەر بە زمانی حاڵ یان بە وتن بێت یان بە نوسین: پەروەردگار دەفەرمووێت سوو حەرام و قەدەغەیە، بەڵام ئێمە دەڵێین لەم ڕۆژگارەدا هەڵسوڕێنەری ژیانی هاوچەرخەو ئابووری بەبێ ئەمە ناچێت بەڕێوە[1]، هەر بۆیە دانی پێدادەنێین و کاری پێ دەکەین، دەیکەین بە بنەماو

---

(١) ئەوانەی وا دەڵێن سوو خۆرە جولەکەکانن و ئەوانەی کە ئوممەیەکانی تر دڵیان بەم قسانە کوێر بووەو خۆیان نابینن، بەڵام ئەوانەی بەرچاو ڕۆشنن هەر لە ئوممەییان خۆیان دەڵێن کەوا دەرئەنجامێکی حەتمی سوو ئەوەیە سامان و داهاتەکان لە گیرفان و دەستی کۆمەڵێکی کەم دا کۆ دەبێتەوەو بە تێپەرینی کات ئەم کەسانە کەمتر دەبنەوە نەبوونی و هەژاری باڵ بەسەر زۆرینەی خەڵك دا دەکێشێت و ئەم کۆمەڵەیش بەردەوام لە زیادبووندا دەبن ئەگەر ویستت لە زانیاری زیاترە بڕوانە ڕاپۆرتەکەی ڕاوێژکاری ئەڵمانی(شاخت) دەربارەی سوو خواردن.

بنچینەی مامەڵەکردنمان بە پارەو سامان.

پەروەردگار تۆ فەرمووت: زینا قەدەغەیەو سزای دیاری کراوت لە قورئانەکەت و سوننەتی پێغەمبەرەکەتدا(صلی الله علیه وسلم) بۆ داناوە، بەڵام ئێمە پێمان وایە هەر تاوان نی یە تاوەکو لە بنەڕەت دا شایستەی سزا دان بێت لە کاتێکدا کارەکە بە ڕەزامەندی هەردوولا بێت و، ئافرەتەکە نا کامڵ ( منداڵ یان شێت) نەبێت، ئەگەر ڕوویشی دا ئەوا بە تێڕوانینی ئێمە تاوانێکە سزاکەی شتێکی دیکەیە جگە لەوەی تۆ بڕیارت لەسەر داوە!

ئەی پەروەردگار تۆ سزای دزی کردنت بە دەست بڕین داوە، ئێمە بە سزایەکی دڕندانەو دوا کەوتوانەی دەبینین، لای ئێمە سزاکەی تەنها بەند کردنە، ئەم سزایە ڕێك و پێك و شایستە بە مرۆڤەکانی سەدەی بیستەمە! تۆ حەرامت کردووە بە تەنها لەگەڵ کەسێکی نامۆدابین(ژن و پیاو)، هەروەها تێکەڵاو کردن بە نامەحرەمت لێ قەدەغە کردووین، لە ئافرەتت قەدەغە کردووە خۆی ڕووت بکاتەوەو جوانیەکانی بۆ نامەحرەم دەربخات، بەڵام ئێمە پێمان وایە ئەمانە قەیدی ناکات و هیچی تێدا نی یە و بێ زیانە، بەڵکو تەنانەت بە پێداویستیەکانی ژیانی هاوچەرخی دادەنێین، بگرە بە دەستکەوتی مافەکانی ئافرەتی(سەربەستی) دەبینین، هیچ ڕێگەیەك نی یە لێی زەوت بکاتەوەو هەتاوەکو نەبین بە کۆنەپەرست و دواکەوتوو...

چۆن وا بەخۆمان بڵێین ئێمە باوەڕمان بە(لا اله الا الله) هەیە واتە هیچ پەرستراوو حاکمێك نی یە، جگە لە خودا و ئەگەر وامان ووت و لەم لاوە سەدان هاوشێوەی تر لەم نمونانە بە زمانی حاڵ یاخود وتن یاخود نوسین بڵێینەوە؟ ئەگەر ئەمانەمان کرد ئیتر چی لە وتەی(لا اله الا الله)ەکەمان ماوەتەوە؟

چی ماوەتەوە تەنها وشەیەك نەبێت بە هەوادا دەڕوات و هیچ حسابێکی لە

جێ بەجێکردن و هیچ بەهایەکی لە ژیانی راستەقینەو کرداری دا نەماوە؟ بریاردان و دانپێدانان بە خودایەتی(الله)دا هاوتا لەگەڵ یەکتا پەرستنی و خودایەتی تەنها بۆ خۆی ئەمە مانای(لا اله الا الله)یە -کارەکە زۆر لەوە گەورەترە تەنها لە نێو دەروون دا(یقین)ێکی رووت و بڕیار بدەیت بە زمان کە خودا دورستکەرمانە، هەر خۆی رۆزی پێ بەخشمانەو بالادەستە لە بەرێوەبردنی کارەکانماندا و هەموو مەلەکووت لە دەستی خۆی دایە، ئەمەیە دەمانەوێت مانای( لا اله الا الله)ی تێدا سنووردار بکەن.... خۆ عەرەبەکانیش لە نەفامیدا دانیان بەمانەدا دەنا لەگەڵ ئەمەشدا خودا بە ئیمانداری هەژمار نەکردن!

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾[١].

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴾[٢].

﴿ قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴾[٣]

چی رێگر بوو لەبەردەم ئیمانداربوونیان لە کاتێکدا دانیان نابوو بە هەموو ئەمانەدا؟ چی وای لێ کردبوون لە دیدو حوکمی خودادا هاوبەشی پەیدا

---

(١) سورەتی لقمان(٢٥).

(٢) سورەتی الزخرف(٨٧).

(٣) سورەتی المؤمنون(٨٤-٨٩).

کاربن؟ دوو هۆکاری سەرەکی: پەرستنی جگە لە خوداو، حەڵاڵ کردنی حەرام و حەرامکردنی حەڵاڵ(واتە دانانی رێیسای دەستکرد) بە جگە لەو حوکمەی خودا ناردوویەتی:﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ ﴾[1]. ﴿ وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ[2] إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴾[3].

خودا ئاگاداری مەبەستمانە بەم روونکردنەوانەمان، مەبەستمان دەرکردنی حوکم نی یە بەسەر هیچ کەس لە خەڵکی.

ئەم مەسەلە پێشتر لە دوو کتێبی تردا روونمان کردبوویەوەو[4]لەم قۆناغەی ئێستای ئوممەتی ئیسلام دا خۆمانی زۆر لێ نادەین، بەڵام ئێمە تەنها لە گەیاندنی روونکردنەوەی پێویست داین کە سپاردەیەکی ئەستۆمانە و لەسەر هەموو کەسێکە شتێك دەربارەی راستیەکانی ئەم ئایینە شارەزا بێت. لەسەری پێویستە بۆ ئەو کەسانەی ئەم راستیانە نازانن بەڵکو ئەو هەڵانەی هەیانە بیگۆڕن و راستی بکەنەوەو خوداش بۆیان بگۆڕێت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ ﴾[5].

ئوممەتی ئیسلام بەم دواییانە زۆر لە راستیەکانی ئیسلامی لەبیرچۆتەوە

---

(١) سورەتی النحل(٣٥).

(٢) خودایە گیان رۆزی بەخش و بەرێوەبەری هەموو شتێك دانی پێدادەنێن و شوێن شەریعەت و رێساکان ناکەون، وە خودایەکی دورستکراو و هەڵبەستراو رێستان بۆ دادەرێژێت و لە شەریعەتە دەستکردەکەیدا شوێنی دەکەون.

(٣) سورەتی النحل(٥١).

(٤) بروانە (واقعنا المعاصر) و(مفاهیم ینبغی ان تصحح).

(٥) سورەتی الرعد(١١).

کە پێشتر ڕاستیەکی بەڵگە نەویست بووەو پێویستی بە قسە لەسەر کردن نەبووە. لەنێو ئەو ڕاستیە لەبیرکراوانەدا ئەم مەسەلە مەترسیدارەیە، ئەویش پێویست بوونی(واجب) حوکمکردنە بەوەی خودا ناردوویەتی و بەبیروباوەڕێکەوە کە ئەگەر وازی لێ بهێنیت لە موسڵمانیەتی بێ بەری دەبیت و، دان پێدانانی ئەو ڕێسا دەستکردانەی جگە لە خودا ناردوویەتی و ڕازی بوون پێی هاوبەش پەیداکردنێکە لە ئاینەکە دەری دەکات و لە ڕێچکە دەردەچێت .

بیروبۆچوونی ئاژاوەگێڕەکان لە کۆندا ڕێگە خۆشکەر بوون بۆ ڕاڕاکردن و لەفکردنی ئوممەتی ئیسلام بۆ زۆرێك لە ئەرکە پێویستەکان(واجب) ـ یاخود کەمێك لە خەڵك بە هۆی تەمبەڵی و پاشکەوتنیان لەو کارە پێویستانە بیانوو دەهێننەوە ـ بەڵگە و بنەمایان گوایە کارکردن و کردار ناچێتە بازنەی باوەڕ هێنانەوە، ئیمان تەنها بەدان پێدانان و بڕواهێنان بەدەست دەهێنرێت.

هێرشی داگیرکارانی خاچپەرست بە سەربازی فیکرییەوە پاڵنەرێکی ترسناك بوو موسڵمانانی بەرەو پاشتر برد لەوەی خۆیان تێ کەوتبوون و سەرباری کەمتەرخەمی و بەلا ڕێی دا چوونیان.. لە شەریعەتی خودا وەدەری نان و کارەکەی لەبەر چاو شیرین کردن و ڕازاندیەوەو زیاتر نقوومی گومڕایی کردن و، وای تێگەیاندن لە دوای ئەم کارانەشیانەوە هێشتا لەنێو بازنەی ئیمان و باوەڕدان .... موسڵمان بەرەنگاری پەلامارو هێرشە سەربازی و فیکریەکان بویەوە بە گوێرەی ئەو تواناو وزەیەی تێیدا مابوو.... بەڵام ئوممەتی ئیسلام خۆی لە خۆیدا بەدەست پاشکەوتن و ساردبوونەوە دەیناڵاند بە هۆی لادانیان و ئەو نەخۆشی و خۆرانەی لە ناو خۆیدا تێ کەوتبوو، وای لێکرد بەرەنگار بوونەوەکەی زۆر لەوە لاوازتر بێت بەرگەی ئەم پەلامارە ئیفلیجکارە بگرێت، هەر بۆیە ڕێگا خۆشکەر بوو بۆ داگیرکەران و هەرچیەکیان ویست لە لادانی

ئوممەتی ئیسلام لە ئایینەکەی و دوورخستنەوەی بۆیان هاتەدی...

چەندین نیازو مەبەستیان لەپشت وەلانانی شەریعەتی خوداوە لەسەر فەرمانڕەوایی حەشاردابوو.. ئەوان دەیانزانی لە دوای لابردنی پشتێنەی یەکەم – عروە الحکم –(پشتێنەی حوکمرانی ) پلە بە پلە پشتێنەکانی تر لادەچن، وەك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هەواڵی پێداوین(لتنقضن عری هذا الدین عروة عروة کلما نقضت عروة استمسك الناس بالتي بعدها فأولهن نقضا الحکم و اخرهن نقضا للصلاة) [1].

(روکنەکانی ئەم ئایینە یەك لە دوای یەك وازی لێ دەهێنرێت، هەر کاتێك یەکێکیان بەردەبێت خەڵك دەستی بەوەی دوایی ئەوەوە دەگرێت، یەکەمیان وازهێنانە لە حوکمکردن بە حوکمی خوداو کۆتا دانەشیان وازهێنانە لە نوێژ).

بەمە ویستی بزوتنەوەی بەگاورکردن لەنێو جیهانی ئیسلامیدا بە ئاسوودەیی و دڵنیاییەوە کاری خۆیان کرد، هەر کەسێك بیانەوێت لە ئایینەکەی لایبدەن و تووشی گومڕایی و لادانی بکەن کردیان. هەرچیەکیان ویست ئەنجامیاندا.. لە کاتێکدا ئەگەر شەریعەت لە حوکمڕانی دا بمایەتەوە بواری ئەم بزوتنەوەیە نەدەما، حوکمی هەڵگەڕاوە بەسەر ئەوانەدا جێ بەجێ دەکرا لە ئیسلام هەڵدەگەڕانەوەو دەبوونە گاور.

مەبەستی ئەوان بڵاوکردنەوەی بەرەڵایی و داوێن پیسی بوو لەنێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، تاوەکو لە رەوشتەکانی دابماڵرێت و جڵەویان بدەنە دەست داگیرکەر -خۆ ئەگەر شەریعەت حوکمڕان بوایە- نەیاندەتوانی یانەی فەرمی بۆ داوین پێسی بکەنەوەو دەوڵەتی(موسڵمان) بیانپارێزێت و دایبمەزرێنێت و بەپاسەوانەکانی ئاگاداریان بکات! هەروەها بە فەرمی یانەو

---

(١) رواه احمد.

دوکانی مەی بکاتەوە تاوەکو خەڵك بە ئاشکرا بخۆنەوە بە ناوی(خواردنەوە روحیەکان)ەوە [١].

هەروەها کردنەوەی شوێنی سەماکردن بۆ بێ رەوشتەکان و دواتر ناوی خۆیان دەنێن(هونەرمەندان)! بەم شێوەیە خەڵك سەرقاڵ و نقومی ئارەزوو ڕابواردن دەکەن و، لەنوێژو ڕۆژوەکانیان و لەدونیاو دوا ڕۆژیان وەریاندەگێڕن لەژێر ناونیشانی هونەرو شارستانیەت و پێشکەوتن دا!!

لێرەدا ئیماندار تەنها دڵەکانی بۆ ماوەتەوە هەموو ئەم کارانەی پێ رەت بکاتەوەو، دەستەکانی دەستەوسانەو زمانی بێ ئومێدە لە نکۆڵی کردنیان، ئەم برەی کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (اضعف الایمان ولیس وراء ذلك من الایمان حبة خردل) واتە: لاوازترین ئیمانەو دوای ئەمە دەنکە خەردەلێك ئیمان نامێنێت) لەکاتی پەلاماری خاچ پەرستەکاندا ئەوەندەشیان پێ زۆر بوو نەوەك ڕۆژێك پەرەبسێنێت و ببێت بە راپەرینێکی تێکۆشانی راستەقینەو تێکیان بشکێنێت، کە شتێکی مەترسیدارەو دەیانتۆقێنێ. پاشان هێرشە فیکریەکەیان کاری لەسەر ئەوە کرد ئەم شتانە بکاتە بنەماوجێگیرو جێ بەجێی بکات و ئەگەر لەم کارەی ئەمان لایاندا – بە گەڕانەوە بۆ لای شەریعەتی خودا – بە کۆنەپەرست و دواکەوتوو ناوەزەند دەکرێت و پێشکەوتن خوازان خۆیانی لێ لابدەن.

بۆ ئەم کارە پەنایان بردە بەر هەموو هۆکارەکانی راگەیاندنی بەردەستیان لە پەرتووك و گۆڤارو چیرۆك و شانۆو سینەماو کەناڵ و رادیۆکان(دواتر

---

(١) ئەوروپیەکان بەمەی دەڵێن(خواردنەوە کهولیەکان spiritual) بەڵام وەرگێڕە دەروون پیسەکان ووشەی spiritual بەڕۆحی وەریانگێراوە ئەوەیان بە هەل زانیوە کە وشەکە ئەوروپیە و دەکرێ هەردوو مانا بگەیەنێت: ڕۆحی و کهولی سەر لێشێواندنەکە لە لایەن وەرگێرە عەرەبیەکانەوە روونە.

تەلەفزیونەکان)، لە لایەکی ترەوە لەنێو پرۆگرامەکانی خوێندندا قاڵبێکی چەق بەستوو و دواکەوتوو کۆنەپەرستی بەبەر ئیسلام و شەریعەتەکەیدا بڕی، لەو لایشەوە وێنەی ئەوروپا بەهەموو لایەن و بوارەکانیەوە بە پێشەنگی شارستانیەت و پێشکەوتن و بەرز نیشان دەدەن، بەمشێوەیە نەوە یەك لە دوایی یەکەکان دێن و دەربارەی ئەوروپا شارەزا دەبن[1] و هیچ زانیاریەکیان سەبارەت بە ئیسلام نی یە تەنها چەند لایەنێکی شێوێندراو وای لێ دەکات بەگومان بێت لە ئیسلامەکەی!

لەسەروی هەموو ئەمانەوە مەبەستەکەی بەهێز دەکردو پشت ئەستوریان کرد بە فکری(ئیرجائی)، کە دەڵێت: باوەڕهێنان وئیمان(بریتی یە لە باوەڕکردن و دان پێدانان)، کردار ناچێتە پێناسەی باوەڕو ئیمانەوە، هەروەها پەنایان بردۆتە بەر ئەو زانا ئاینیانەی هەندێکیان لە سادەیی و بێ ئاگایی دەربارەی ئەم باسەو مانای(ارجائی) وتەیان هەیەو ئەمانیش دەیقۆزنەوە، ئەوان بێ مەبەست بوون لێی بەڵام هەندێکیان لادەر بوون و بەئەنقەست مەبەستیان بووە خەڵکی سەر لێ شێواو بکەن.

**ئای داخ و حەسرەت لە بۆ بەندەکان!**

ئەم بۆچوونەی ئوممەتی پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) کە حوکم کردنە بە جگە لە شەریعەتی خودا کارێکی سەمەرەو مایەی سەرسوڕمانەو زۆر

---

(١) زانستەکەیان دەربارەی ئەوروپاش تەواو نی یە چونکە شارستانیەتەکەیان چەند لایەنێکی باشی هەبوو، سەرباری لادانە روون و ئاشکراکانی، بەڵام نەیاندەویست موسڵمانان فێری لایەنە چاکەکان بن و لە راپەرینەکانیان دا لێ ی سوودمەند بن، بەڵکو تەنها مەبەستیان بوو زۆر بە چاکی بەدڕەوشتیەکان و بێ باوەڕی و بێ ئایینی یان فێر بکەن بۆ ئەوەی ببێت بە خۆرەیەك و بکەوێتە جەستەی ئوممەتی ئیسلام.

قێزەونە... هەموو بەڵاکان بە گشتی قێزەونی ئەم کارەیان پێ پەردە پۆش ناکرێت، هەروەها بەکرداری و ناخۆشیەکانی لە واقیعدا پاساوی نادەن!

چۆن ئەم ئوممەتە وازی لە پەیامەکەی و، لەو ناوبانگەی خودا جیایی کردبووە پێی هێناو لە دەستی دا؟ ئایا ئومەتێکی لێ دروست کردن لە پاشکۆو دوایی کاروانەوە بە هەناسە برکێ بەدوایی کاروانچییەکاندا ڕابکات؟!

یاخود کەسایەتی هەژاندوون و پاشان تاواندوویەتیەوە تاکوو ببێت بە وێنەیەکی لاسایی کردنەوە، بەڵکو شێواو لە نەفامی؟! ئایا ئەم ئومەتەی نەهێناوە تاوەك پێشەنگ و سەرکردە و شایەت بێت بە سەر هەموو مرۆڤایەتیەوە؟!

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ﴾[1].

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾[2].

ئایا هیچ لەمانەت بۆ بەدی دەهێنرێت لە کاتێکدا تۆ پشت لە شەریعەتی خودا دەکەیت و پرۆگرامی نەفامی جێ بەجێ دەکەیت؟

لەوانەیە کەسانێك وا بیربکەنەوە کە بۆ سەلماندن و چەسپاندنی بوونمان پێویستمان بە فڕۆکە و بۆمب و ئامێرەکان و کارگەکان و زانست و تەکنەلۆژیایە... لە ڕاستیدا ئێمە هەموو ئەمانەمان لەلا نییە و پێویستیمانە... وازیش لەوە بێنە هۆکاری نەمانی هەموو ئەمانە دوا کەوتنمان بوو لە ماناو

---

(١) سورەت ال عمران(١١٠).

(٢) سورەتی البقرة(١٤٣).

ڕاستیەکان و تەواوکاریەکانی(لا اله الا الله)یەو، لەوەش کە کاتێك ئێمە بەڕاستی پەیڕەوی تەواوکاری و داواکاریەکانی(لا اله الا الله) بووین زاڵ و جێگیر بووین لەسەر زەوی و لە هەموو بوارەکانی ژیان دا لە ڕیزی پێشەوە بووین، چونکە خودا هەموو هۆکارەکانی چاکەی راستەقینەی لە تەواوکاری و داواکاریەکانی(لا اله الا الله)دا کۆکردۆتەوەو کار ئاسانی دەکات بۆ ئەوانەی بە ڕاستی پەیرەوی (لا اله الا الله) دەکەن.

ئێستا واز لەمانە بێنە با وای دابنێین -بە خەیاڵێکی سەرکەش و یاخیەوە- ئێمە بووینەتە خاوەنی هەموو ئەم ئامرازو ئامێرانەمان هەیە کە(دەوڵەتە مەزنەکان) هەیانە! وەك یەك پاشان یاسای خودامان جێ بەجێ نەکرد.. لە کێشانەی خودادا چی زیاد دەکەین لەوە زیاتر کە گەلێکی نەفام بین و ماوەیەك لە کات دەستەڵاتدار دەبین و پاشان چارەنووس لە ناوچوون و ڕووخانە لەسەر زەوی و پاشان سزایەکی بە ئازار بۆ رۆژی دوایی و لێ پرسینەوە!!

﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾[1].

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾[2].

بەڵکو خودا ئەم میللەتەی بۆ شتێکی زۆر لەمانە مەزنتر هێناوە...

(١) سورەتی الانعام(٤٤ — ٤٥).

(٢) سورەتی هود(١٥ — ١٦).

هێناومیەتی تاوەکو ببێت بە نمونەیەك، مرۆڤایەتی شوێن پێیان هەڵبگرێت و ڕێنمونی و ڕێ پیشاندەریان بێت بۆ لای پەروەرگاریان و، پرۆگرامەکانی لەسەر زەوی جێ بەجێ بکەن و بەم شێوەیە پاداشتی دنیاو دوارۆژ و ڕەزامەندی خودا بەدەست دەهێنن...

ڕۆژگارێک هەبوو ئەم نمونە پایەدارە لە جیهانی واقیعدا هاتەدی و جێ بەجێ کرا... هەروەها ئەو هێز و چەسپاندن و دەستەڵاتە ناگەڕێتەوە هەتاوەکو نەگەڕێنەوە سەر ئەو هۆکارانەی پێشتر بوونە هۆی ڕوودانی ئەو بارودۆخە!

﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔا ﴾[1].

پەرستشی ڕاستەقینەی خودا ڕوونادات بێ بەری بێت لەهەموو هاوبەش دانانێك هەتاوەکو بە تەواوەتی پەیڕەوی شەریعەتی خودا نەبن و جێ بەجێ ی نەکەن واتە حوکمی پێ بکەن:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴾[2].

---

(١) سورەتی النور(٥٥).

(٢) سورەتی النساء(٦٥).

## دەروازەی دووەم

# ئایا فەرمانڕەوا (وەلی ئەمر) دەتوانێ بە گوێرەی بارودۆخ دەستکاریی حوکمەکانی شەریعەت بکات؟

ئەوانەی بە شوێن بەهانەو بیانوو و بەڵگەدا دەگەڕێن تاوەکو لە پەیرەوکردنی جێ بەجێ کردنی شەریعەت خۆیانی پێ بدزنەوە، دەڵێن فەرمانڕەوا(وەلی الامر) بە گوێرەی بارودۆخ بۆی هەیە دەستکاری حوکمەکانی شەریعەت بکات.. هەر چۆن عومەری کوری خەتتاب ساڵی وشکە ساڵی و گرانیەکە دەست برینی دزی ڕاگرت و پشکی ئەوانەی تازە موسڵمان و دڵیان بەلای ئیسلامدا هاتووە(مؤلفة قلوبهم)ی لە خەرجیەکانی زەکات لابردو هەڵوەشاندەوە.. ئەگەر عومەر(رەزای خوای لێ بێت) ڕێگە پێدراوبووبێت ئیتر بۆچی بۆ فەرمانڕەواکانی ئەمڕۆ ناکرێت، لە کاتێکدا شتەکان ئێستا، لە گۆڕانێکی ئەوپەری دایەو وا دەخوازێت چاوبخشێنرێتەوە بەوانەی دەکرێ و بەوانەی ناکرێت و ئەوەی گونجاوەو ئەوەی نەگونجاوە؟!

تاوانبارکردنی عومەر بەدەستکاری کردن لە خودی خۆیەوە بۆ حوکمەکانی شەریعەت و بەپێی بارودۆخی سەردەمەکەی کارێکی ترسناك و مەترسیدارە ناکرێت هەروا بەبێ هەڵوەستەکردن لەسەری و لێکۆڵینەوە تێپەڕێندرێت. خۆ عومەر(رەزای خوای لێ بێت) فەرمانڕەوایەکی سەربازی نەبوو بەپێی ئارەزووەکانی خۆی یاری بەکارەکان بکات، هەرچۆن ستەمکارێك نەبوو لەسەر زەوی بە وێنەی فیرعەونەکان بڵێت:﴿مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾[1].

لەلایەکی تریشەوە هاوەڵان(رەزای خوایان لەسەر بێ) هەروا بێ دەنگ نەدەبوون و دەستەوسان نەبوون لەسەر گۆڕینی شەریعەتی خودا، یاخود

---

(١) سورەتی غافر(٢٩).

لابردنی لەلایەن هەر کەسێکەوە بێت ئیتر ئەو کەسە عومەر یاخود جگە لە عومەر بێت... دەبێت باش لەبیرمان بێت ئەو عومەرەی(ڕەزای خوای لێ بێت) سەرباری ئەو هەیبەتەی خودا پێی دابوو رووخسارێکی وای هەبوو بە هۆی باڵابەرزەکەی و ئازایەتی و دەنگە گەورەکەی ڕۆژێك کە چووە سەر مینبەر و وتاری بۆ خەڵك داو وتی: ئەی خەڵکینە ببیستن و گوێڕایەڵ بن !

سەلمانی فارسی(ڕەزای خوای لێ بێت) قسەکەی پێ بڕی و وتی: ئەمڕۆ نەگوێت لێ دەگرین و نە گوێڕایەڵیت هەیە لەسەرمان! عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەبەرچی؟ وتی هەتا بۆمان ڕوون نەکەیتەوە ئەو پارچە قوماشەت لە کوێ بوو کراسەکەی تۆ ئاوا درێژە و تۆ پیاوێکی باڵا بەرزیت و یەك پشك بەشی تۆ ناکات هەروەك هەموو موسڵمانان یەك پارچەیان بەر کەوتووە! پاشان عومەر بۆی ڕوون کردنەوە کەوا عبداللەی کوڕی بەشەکەی خۆی پێداوە تاوەکو بەشی بکات، سەلمان وتی: کەواتە ئێستا فەرمان بکە! گوێ دەگرین و گوێ ڕایەڵ دەبین!.

لێرەوە تێدەگەین عومەر(ڕەزای خودای لێ بێ) لێی چاوەڕوان ناکرێت سەرپێچی لە شەریعەتی خودا بکات، هاوەڵانیش لێیان چاوەڕوان ناکرێت بێدەنگ بن لەسەر ئەو سەرپێچیەو چاوپۆشی لێ بکەن، ئەگەر چی لە لایەن ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتتابیشەوە بێت.

لە ڕاستیدا ئەوانەی بە دوای بیانوو بەهانەدا دەگەڕێن بەم کارەی عومەر ناڵێن(سەرپێچی) بەڵکو ناوی لێ دەنێن(هەڵس و کەوت و دەستکاری) تاوەکو بیکەن بە بنەماو بناغە بۆ ئەوەی پێیان خۆشەو دڵیان دەیخوازێت بیکەن و بە هۆیەوە خۆیانی لە پەیڕەوکردنی شەریعەتی خودا پێ بدزنەوە، ئەویش ئەوەیە فەرمانڕەوا(وەلی الامر) بۆی هەیە بەپێی دیدو بۆچوونی خۆی و بەپێی بارودۆخەکان دەستکاری شەریعەت بکات! بەهۆی هەندێك لەم(زمان

لوسیانەیان) فەرمانڕەواکانی ئەم ڕۆژە خۆیان لە هەموو شەریعەت ڕزگار بکەن و بەڵگەیان ئەوەیە ناگونجێت لەگەڵ ئەم بارو دۆخەی ئێستادا!

پاشان با بڕوانینە کارەکەی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) بزانین: ئایا ئەوە بەتاڵ کردنەوەو لابردنی شەریعەت بوو یان(دەستکاری) کردن بوو تێیدا؟ یاخود ئەو پەری پابەندبوون بووە بە شەریعەتی خوداوە لەگەڵ ئیجتهادکردنێکی پێکراو بۆ شێوەیەکی ڕاستەقینەی جێ بەجێ کردن؟

عومەر ساڵی گرانی بێ بارانیەکە دەست برینی دزی ڕاگرت ئەم هەڵسووکەوتەی چ مانایەکی هەبوو؟ با بگەڕێینەوە سەر نیازو مەبەستەکانی شەریعەت، ئیسلام سەرەتا بڕیار لەسەر سزا و جێ بەجێ کردنی سزاکان نادات، بەڵکو هەوڵ دەدات سەرەتا کەلێن و دەروازەکانی تاوان دابخات هەتاکو هەر لە سەرەتاوە ڕوونەدات، پاشان ئەگەر تەماشا کرا بکەر لە هەموو حاڵەتەکانەوە هیچ بیانوو و بەهانەیەکی نیە، ئەوا سزای لەو کاتەدا لەسەر جێ بەجێ دەکرێت و، دەبێت تەواو ڕوون بکرێتەوە کەوا بیانووی لەو کارەی دا نەبوو ئەگینا ئەگەر گومان هەبوو و نەچەسپا سزا ڕادەگیرێت..

ئەمە شەریعەتە، هەر ئەمە بووە بە تایبەت عومەر کردوویەتی! پێی وابووە ئەو برسێتی و قات و قڕی یە هۆکارو پاڵنەر بووە بۆ پەنابردنە بەر دزی کردنەکە، بۆیە گومان و شوبهەکە سزاکە دەوەستێنێت، سزاکەی جێ بەجێ نەکرد لەبەر ئەوەی دڵنیا و بێ گومان بێت لەوەی دزی کردنەکەی بێ بیانوو و بەهانە بووە یان نا... ئایا عومەر لەم کارەدا شەریعەتی خودای گۆڕیوە یاخود هەڵی وەشاندۆتەوەو جێ بەجێی نەکردووە؟ یان لەوپەڕی جێ بەجێ کردن و پەیڕەوکردنی دا بووەو بە ووردی و دیقەتێکی تەواوەوە؟

ئیجتهادێکی دی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) هەڵوەشاندنەوەی پشکی

ئەوانەی دڵیان وا بەستەی ئیسلام بووە لە خەرجیەکانی زەکات.لە ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتووە: ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾[1].

عومەر(رەزای خوای لێ بێ) وتی: خودا ئیسلامی سەربەرزو باڵادەست کردووە ئیتر دڵ پەیوەست بوون پێویست نی یە تاوەکو تازە موسڵمان بن. ئایا ئەمە هەڵوەشاندنەوەیە عومەر(رەزای خوای لێ بێ) بۆ شەرعەتی خودا کردوویەتی؟ یان ووردبوونەوەو تێروانینە بۆ هۆکارەکانی جێبەجێکردنی، بە ئیجتهادی خۆی وای بینیوە ئیتر وا بەستە بوون و دڵ ئالودەبوونی بە ئیسلامەوە پێویست نی یە دوای ئەوەی خودا ئیسلامی باڵادەست کرد، ئیتر خەرجکردنی ئەم پشکە و لەم بارودۆخەدا نامێنێت، ئەویش بەهۆی بەرزی سەرکەوتنی ئیسلامەوەو خەڵك بە خۆشی خۆیان موسڵمان دەبن یان بە هۆی سەرکەوتنی موسڵمانانەوە لە شەڕەکاندا لە هەردوو بارەکەدا پێویست بە پەیوەستی دڵەکانەوە نەماوە، ئەوەی بە ویستی خۆی موسڵمان بوو ئیماندارێکی ڕاستەقینەو باوەڕ لە دڵیدا چەسپاوە، ئەوەیشی بەزیوەو بووە بە ژێردەستە هۆکارێك وای لێ کردووە بێتە ناو ئیسلامەوەو وەڵامی هۆکارەکەی خۆی داوەتەوەو ئەوە بەس بووە کە هاتۆتە ناو ئیسلامەوە!

ئەگەر عومەر بیووتایە: هێشتا کەسانێك ماون پێویستیان بەوەیە دڵیان ڕابگیرێت بەلای ئیسلام دا، چونکە هێشتا ئیسلام لەسەر زەوی دا بە تەواوەتی نەچەسپاوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا وای دەبینم ئەم پشکە لە زەکات خەرج ناکەم بۆ دڵ پەیوەست کردن و وابەستەکردنی... ئەگەر وای بووتایە دوور لە

---

(١) سورەتی التوبە(٦٠).

عومەری ئیماندارو خۆپارێز و لە خوا ترس کەوا بڵێت ئەو کاتە سەرپێچیەکە رووی دەداو نە لە عومەر و نە جگە لە عومەر قبوڵ نەدەکرا و ئەو کاتە دەبوو بە گۆڕین و دەستکاری کردن بۆ شەریعەتی خودا.

بەڵام جێبەجێکردنی حاڵەتێك دەقێکی بەسەردا جێ بەجێ نەکرێت و نەچەسپێت ئەوا دەقەکە ناسەپێندرێت بەسەریدا چونکە بۆ ئەو نی یە، هەڵس و کەوت کردنیش لەمەدا زۆر دوورە لە گۆڕین یان دەستکاری و خستنەبری لە شەرعی خوادا.

با نمونەیەکی دی بۆ روون کرنەوەی ئەم حاڵەتە وەربگرین: یەحیای کوڕی سەعد دەڵێت: عومەری کوڕی عبدالعزیز ناردمی بۆ کۆکرنەوەی زەکات و سەدەقەی ئەفریقیا و کۆم کردەوە، پاشان بە دوای هەژاران دا گەڕام تاوەکو دابەشی بکەم بە سەریاندا بەڵام نەبوو چونکە عومەری کوڕی عبدالعزیز خەڵکەکەی خۆش گوزەران کردبوو و هەژاری نەمابوو منیش بەندەم پێ کڕی و ئازادم کردن. ئایا دەکرێ بەم کارە بڵێین عومەری کوڕی عبدالعزیز شەریعەتی هەڵوەشاندۆتەوە یان لێ ی لاداوە، چونکە پشکی هەژارانی لە ماڵی زەکات خەرج نەکردووە؟ یان دەتوانین بڵێین حاڵەتێك هاتۆتە ئاراوەو دەقی چەسپاوی لەسەر نەبووەو ئیتر جێ بەجێ نەکراوە؟

هەروەك چۆن عومەری کوڕی خەتتاب(رەزای خوای لێ بێ) کردی لە جێ بەجێ نەکردنی سزای دزی لە ساڵی گرانی و وشکە ساڵیەکەدا، هەروەها ڕاگرتنی پشکی تایبەت بە(مؤلفە القلوب) لە خەرجیەکانی زەکات.

ئەمە لە کوێ و بانگەشەی ئەمانە لە کوێ کە دەیانەوێ ماڤ تەواو بە فەرمانڕەواکان(ولی الامر) بدەن تاوەکو هەموو شەریعەت هەڵبوەشێنێتەوەو لە جێگەیدا یاسا و رێساکانی نەفامی دابنێن بە بیانووی نەگونجانی بارو دۆخەکان؟!

فەرمانڕەوا(ولی الامر) لە ئیسلام مەرجی دەست بەکاربوون و شەرعیەت پێدانی جێبەجێکردنی شەریعەتی خودایەو بەبێ ئەم مەرجە ڕەوایەتی لە دەست دەدات، ئیتر چۆن مافی ئەوەی هەیە مەرجی دەست بەکاربوون و سەرچاوەی دانانەکەی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە؟!

هەروەها فەرمانڕەوا(ولی الامر) مافی گوێ گرتن و گوێڕایەڵی بەسەر بن دەستەکانیەوە هەیە لە سنووری گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی، ئەگەر سەرپێچی لە خوداو پێغەمبەرەکەی کرد بە لە کارخستنی شتێك لە شەرعی خودا ئیتر مافی گوێڕایەڵ بوونی خەڵك بۆی لە دەست دەدات.

خوای بالا دەست دەفەرمووێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴾[1].

لە دارشتنە زمانەوانیەکەی ئایەتەکەوە بە ئاشکرا دیارە کە ڕەها(مطلق) بۆ خودایەو پاشان گوێڕایەڵ کردنی پێغەمبەرەکەیەتی(صلی الله علیه وسلم) بەڵام گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکان بەو جۆرە نی یە چونکە ئەگەر خودا بیفەرمووایە: (أطیعوا الله واطیعوا الرسول واطیعوا اولي الامر منکم) واتە: لەگەڵ فەرمانڕەوایشدا ووشەی(أطیعوا)ی دووبارە بکردایەتەوە گوێڕایەڵ کردنیان وەك خودا و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ڕەها(مطلق) دەکرا.

بەڵام خودا بەم شێوەی نەفەرمووە بەڵکو گوێڕایەڵی فەرمانڕەوا(اولی الامر)ی بەستۆتەوە(عطف) کردووە بە گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) بەبێ دووبارە کردنەوەی کارە داخوازیەکەی(اطعیوا) تاوەکو

---

(١) سورەتی النساء(٥٩).

هەمیشە گوێ ڕایەڵی کردنیان بەسترابێتەوە بەو سنورانەی خودا دیاری کردووە، هەروەها ئایەتەکە جەخت لەسەر یەك خستنی ئەو بۆچوونە دەکاتەوەو روونی دەکاتەوە کە کاتێك دەستەوسان دەبێت و لە کاتی کێشەکاندا سەرچاوەی گەڕانەوەیان تەنها خوداو پێغەمبەرە و بەس.

هەر بەو شێوەی یەکەم خەلیفەی ئەم ئوممەتە لێی تێگەیشتوو(رەزای خودای لێ بێ) کاتێك بە خەڵکەکەی وت: گوێڕایەڵیم بکەن ئەوەندەی من گوێڕایەڵی خودا بووم، ئەگەر سەرپێچیم لە خوداو پێغەمبەرەکەی کرد ئیتر ماڤ گوێڕایەڵی کردنم لەسەرتان نامێنێت.

ئەگەر سنوورەکانی فەرمان کردن لە ئیسلامدا وەها بێت ئیتر چۆن کەسانێك وا بیر دەکەنەوە فەرمانڕەوا(ولی الامر) ماڤ سەرپێچی و یاخی بوونی لە خوداو پێغەمبەرەکەی هەیە لە کاتێکدا خودا دەفەرموێت:﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡ ﴾[١].

ئیتر چۆن کەسانێك هەن وا بیر بکەنەوە کاتێك فەرمانڕەوا(ولی الامر) لە گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی دەردەچێت بە هەڵوەشاندنەوەی شەریعەتی خودا ماڤ گوێڕایەڵی و گوێ لێگرتنی بەسەر ژێر دەستەکانیەوە دەمێنێت، لە کاتێکدا پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بریاری داوە هیچ دروستکراوێك نابێت گوێڕایەڵ بێت لەسەر پێچی و یاخی بوون لە دروستکەرەکەی؟ (لا طاعة في معصية) [٢] واتە: (گوێڕایەڵی لە خراپەو گوناهدا ناکرێت). (إنما الطاعة في المعروف) [٣] واتە: (بەڵکو گوێڕایەڵی لە چاکەو کاری باش دایە) نەخێر

---

(١) سوره الاحزاب(٣٦).
(٢) أخرجه الشيخان.
(٣) أخرجه الشيخان.

فەرمانڕەوا(ولی الامر) بۆی نی یە شەریعەتی خودا هەڵبوەشێنێتەوە یان بیگۆڕێت یان بیخاتە بری چونکە ئەم مافە کەس بە شێوەیەکی ڕەها نیەتی نە کار بەدەست و نە ژێر دەستەکانی.

لەسەر زەوی تاکە هۆکارێکیش بۆ ئەم کارە نابێتە بیانوو پاساوی نادات فەرمانڕەوا پێی هەستێت. نەخودا مۆڵەتی پێداون و نە ئەو پێشینانەیش کە دەیانەوێت لە هەڵس کەوتەکانی عومەرەوە بیکەنە بەڵگە بۆ مەرامەکانی خۆیان.

بەکلا کەرەوەی باوەڕ و ئیمان بەو پێ یەی لە قورئانەکەیدا روونی کردۆتەوە حوکم کردنە بە شەریعەتی خودا، یـان بەرپەرچ دانـەوەی:

﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓاْ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓاْ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ بَلْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾(١).

ئەمانە دەڵێن(لا اله الا الله محمد رسول الله) (ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ ) پاشان زیاتر لەمە دەچنە پێش و وای دادەنێن ئەوان گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەیین ، بەڵام دەربارەیان دەفەرموێت(وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ) خۆیان بە ئیماندار دەزانن بەڵام لێ یان دادەماڵێت و هۆکاری داماڵینی باوەڕەکەیان روون دەکاتەوە ئەوەیە کاتێك بانگ دەکرێت شەریعەتی خودا جێ بەجێ بکەن پشت هەڵدەکەن،

(١) سورەتی النور(٤٧-٥١).

مەگەر تەنها لەو کاتانەدا نەبێت لە جێ بەجێ کردنی دا بەرژەوەندییەکی تایبەتیان هەبێت!

لە بەرانبەر ئەو کارەی ئەواندا هەڵوێستی ئیمانداری ڕاستەقینە روون دەکاتەوە کە بانگ دەکرێن بۆ لای شەریعەتی خودا یەکسەر دەڵێن بیستمان و گوێڕایەڵ دەبین بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی کە خۆیان یان کەس و کاریان چیان بەسەر دێ لە جێبەجێکردنیدا بەڵکو ئەمە گوێڕایەڵیەکی ڕەهایە بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی، ئەمە سیفەتی ئیماندارانەو ڕێگاو دەروازەی سەرکەوتنی دنیاو دوارۆژە.

ئەوانەی خۆیان لە بۆسەدا داناوەو بەدوای بیانوو و بەهانەوەن دەڵێن: ئێمە چۆن سزای دزی بەسەر خەڵکدا بچەسپێنین لە کاتێکدا خەڵك برسییەتی؟ ئایا نابێت سەرەتا تێریان بکەین؟ باری ئابوریمان چاك بکەین پاشان شەریعەت جێ بەجێ بکەین!

ئەمە تەنها پیلان و فێڵێکەو بەسەر کەسدا ناچەسپێت و پیادە نابێت، لەم ساتەوە با دەست بە جێ بەجێ کردنی شەریعەت بکەین، هیچ ترسێك نی یە لەوەی کەسێك لە ژێر سێبەری شەریعەت دا ستەمی لێ بکرێت!

چونکە ئەگەر ئێستاو لەم ساتە وەختەوە دەستمان کرد بە چەسپاندنی شەریعەت ئەوا سزای ئەو دزە نادات لە برسان دا دزی دەکات تا تێر ببێت، بەڵکو گومانی برسێتیەکە کە هۆکاری دزیەکە بووبێت سزاکەی لەسەر هەڵدەگیرێت.. ئیتر پێویست ناکات ئێمە چەسپاندنی شەریعەت لە کار بخەین تاوەکو باری ئابوریمان چاك دەکەین(بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە) ستەم لە کەس ناکرێت لە جێ بەجێ کردنی شەریعەتی خودادا هەروەك خودا باس لە خۆی دەکات لە قورئانەکەیدا، هەروەها لە فەرموودەیەکی قودسی دا پێغەمبەر

بۆمان دەگێڕێتەوە کە خودا دەفەرموێت: (یا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي وجعلته بينكم محرماً فلا تظالموا) [١].

(ئەی بەندەکانم من ستەمکاریم لەسەر خۆم قەدەغەو یاساغ کردووەو لە نێو ئێوەشدا بە قەدەغەکراوی دامناوە ستەم مەکەن).

هەندێکی دی دەڵێن: بۆچی دەستی ئەو دزە ببڕین تا قوتی خواردنی دەست بکەوێت دزی دەکات و واز لە دزی ملیونەها بێنین؟! جێ بەجێ کردنی شەریعەت بۆ ئەو رۆژگارەی ئێستامان نەگونجاوە!! وەك ئەوەی شەریعەت هۆکار بووبێت بۆ ئەوەو ئەوەیان!!

وەك روونمان کردەوە ئەو دزەی لە برسان دا دزی کرد سزاکەی لەسەر جێ بەجێ ناکرێت چونکە شەریعەت وای بۆ داناوە سزاکەی لەسەر لادەبات بەڵام دزی ملیۆنەها چ دەقێك لە شەریعەت دا هەیە بیپارێزێت و پەردەپۆشی بکات بۆی؟! بەڵام کاتێك میللەتی موسڵمان فەرمان بە چاکەو رێگری لە خراپە پشت گوێ دەخات و تەمبەڵی لێ دەکات لە دەستەڵاتی دەستەڵاتداران دەترسێت و حاڵی دەبێت بە بارودۆخی تیاچووەکانی پێغەمبەری خودا باسیان لێوە دەکات و دەفەرموێت: (إذا سرق فيهم الشريف تركوه، وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد)؟ (( ئەگەر ناودارو بە دەستەڵاتێك دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا بەڵام ئەگەر بێ دەستەڵاتێك دزی بکردایە سزایان لەسەر جێ بەجێ دەکرد))، ئەمە لە لایەکەوە قورسایی و باری خۆی لە دنیاو دوارۆژدا دەکەوتە سەری و لە لایەکی تریشەوە یاسایەك نامێنێت لە درندایەتی دەستەڵاتداران بیپارێزێت دوور لە شەریعەتی خودا پەنا دەبات!

ئەوانەی بە دوای بیانوو بەهانەوەن تاوەکو لە جێ بەجێ کردنی شەریعەت

---

(١) أخرجه مسلم

رابکەن دەڵێن: دیموکراتیەت! دیمکراتیەت! یان دەڵێن: ئیشتراکیەت! ئیشتراکیەت! چەندەها، هەزارەها ملیۆن خوێنی گەلانی ئیسلام لەژێر سێبەری دیمکراتیەتی ساختەو ئیشتراکیەت دا ڕژا؟ هەروەها چەندە چین کە پێشتر هەر ناو و ناوبانگ و رەسەنی نەبوو خۆیان دەوڵەمەند کرد پێی و ملیۆنەهایان پێ برسی کرد؟ هەروەها نان و قووتی خەڵکیان لە بازاری رەش دا و پێویستیەکانی فرۆشران و لەو لایشەوە قەرزی زۆریان هێنایە سەر وڵات و لە شوێنی پێویستیشدا خەرج نەکرا و سوودی بە بەرژەوەندی گشتی نەگەیاند تەنها کەمێك نەبێت بەڵکو نان و قووتی ئەم لە سووی ئەم قەرزانەدا دەبرێنەوە.

نا! ئەگەر ئێمە لەبەر پاراستنی ملیۆنەها کەس شەریعەتی ئیسلامی لەکار بخەین ئەمە بەهانەیەکی بێ بنەماو پووچە، چونکە هیچ شتێك بە وێنەی شەریعەتی ئیسلامی پارێزگاری لێ ناکات بە مەرجێك شوێن پێی هەڵبگرن و چاودێری کار بەدەستەکان بکەن و بەلای حەق و ڕاستیدا بیانبەن، هەر بەو شێوەیەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئاراستەی کردووین... چونکە ئەمە لە تەواوکاری و داواکاریەکانی(لا اله الا الله)یە:﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴾[1].

(كلا والله لتأمرن بالمعروف ولتنهون عن المنكر ولتأخذن على يد الظالم ولتقهرنهم على الحق قصراً أو ليضربن الله قلوب بعضكم ببعض) [2].

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: سوێند بەخوا فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن و دەستی ستەمکار لە ستەم رادەگرن هەوڵەکانیان لە حەق دا پێ چڕ دەکەنەوە یان خودا دڵەکانتان دەکات بە

---

(١) سورەتی آل عمران(١١٠).

(٢) أخرجه ابوداود.

دوژمنی یەکتری.

ئێستا ئەگەر بە دڵنیاییەوە زانیمان فەرمانڕەوا(ولی الامر) بۆی نی یە دەستکاری شەریعەت بکات بە هەڵوەشاندنەوەی یان لەکارخستنی یاخود دوا خستنی، هەروەها ئوممەتیش، گەر فەرمانڕەوا ئەو بڕیارەی دا، یاخود جێ بەجێ ی کرد نابێت گوێڕایەڵی بن و... ئێستا ماوە بزانین سنورەکانی فەرمانڕەوا(ولی الامر) لە هەڵس و کەوت و دەستکاری دا چی یە؟

بۆی هەیە بەڵکو لەسەری پێویستە تەنها لە بەرژەوەندی یە(مرسل)ەکاندا بۆچوونی هەبێ کەوا دەقێکی لەسەر نی یە و بەو شێوەی بەرژەوەندی میللەتەکەی تێدا دەستەبەر دەبێت و بە شێوازێك دژایەتی مەبەستەکانی شەریعەت نەکات و تێیدا حەرام حەلاڵ نەکرێت و حەلاڵ حەرام نەکرێت، هەر چۆن بۆی هەیە هەڵس کەوت بکات لەگەڵ کاروبارە گۆڕاوەکاندا کە بەپێی بارودۆخ[1] گۆڕانی بەسەر دا دێت کە تێدا بنەما گشتی بێ، بە درێژایی مێژوو و جوڵەی رۆژگار روویاندا بۆی هاتۆتە خوارەوە تاوەکو رێکی بخات و خۆی بواری هەڵگۆزینی حوکمە گونجاوەکانی بۆ هەر چەرخێك بەجێهێشتووەو بە لەبەر چاو گرتنی هەمان مەرجی پێشوو کە دەرنەچوونە لە مەبەستەکانی شەریعەت و حەرامی تێدا حەلاڵ نەکرێت و حەلاڵی تێدا حەلاڵ نەکرێت، بەلام بۆ فەرمانە جێگیرەکان و لە نێوانیاندا(سزاکان) و پەیوەندی نێوان هەردوو رەگەز و(پەیوەندی یە خێزانیەکان... هتد) کەس ناتوانێت لە هێلی جێگیرەوە بیباتە سەر هێلی گۆڕاو بە هیچ بیانویەك لە بیانووەکان.

---

(١) بڕوانە دەروازەی سێ یەم.

# دەروازەی سێیەم

## (گومانی پەرەسەندن (التطور) و
## پێش کەوتنخوازیی ) و
## (نەشیاویی و شایستە نەبوونی
## شەریعەت بۆ ئەو بارودۆخە نوێیانە
## لەژیانی خەڵك كە هاتۆتە ئاراوە)

ئایا ئەم شەریعەتەی پێش چوارده سەدە هاتۆتە خوارەوە دەشێت حوکمی ئەم واقعەی ئێستا بکات، لە کاتێکدا دوای شۆرشی پیشەسازی و پێش کەوتنی زانست و تێك ئالانی پەیوەندییە مرۆییەکان و ئالۆزبوونیان چەندەها بارودۆخی نوێ لە ژیانی خەڵك دروست بووە، کە لەکاتی هاتنە خوارەوەی ئەم شەریعەتەدا نەبووە؟ ئەگەر جێبەجێ کردنی شەریعەت لە باروگونجاو بووبێت بە درێژایی دە سەدەی لە دوای یەك بە هۆی نزیکی سەدەکان و هێواشی ئەو گۆرانکاریانەی لە ژیانی خەڵك دا روویداوە و چڕبوونەوەیان لە چەند بوارێکدا کە هەر لە سەدەی پێش خۆی چووەو هاوشێوەی ئەو سەردەمە بووە کە شەریعەتی تێدا هاتۆتە خوارەوە، بەڵام ئێستاش هەر دەکرێ بتوانرێ جێ بەجێ بکرێت لە کاتێکدا بارودۆخی پێشتر هەر بە تەواوەتی سڕاوەتەوەو لەناو چووە و، باروگوزەران و دۆخی دی جێگەی گرتۆتەوە، بەڕادەیەك هەر دەڵێی هیچ پەیوەندیەکیان بە پێشترەوە نەماوە؟!

ئەمە بیرکردنەوەی هەندێ خەڵکەو.... دەکرێت لە گرنگترین مەسەلەکان بن کە لە مێشکی(رۆشنبیری) ئەوروپی دا سەبارەت بەجێ بەجێ کردنی شەریعەت هەژاوەو دەخولێتەوە، بە تایبەت گەر لەوانە بێت هەموو شتێك لە روانگەی ڕاڤەکردنی ماددی یەوە وەربگرێت و، تێیدا قوڵچ بوبێتەوە ئەم بیرۆکەیەی کە مارکسیەت هەڵی دەگرێت و، رۆژئاوای(لیبرالی)یش بە رێژەیەك کە کەم نی یە تێیدا بەشدارە[1].

---

(١) لە ڕاستیدا هیچ جیاوازیەکی ریشەیی بەدی ناکرێت لە نێوان بیردۆزو بیرۆکەی(لیبرالی) سەرمایەداری ئەوروپی هێناویە تیە ئاراوەوە لەگەڵ بیرۆکەی

لێرەدا دەمانەوێت لە دوو لاوە گفتوگۆ لەسەر مەسەلەکە بکەین: مەسەلەی پەرەسەندن و پێشکەوتن کە بەبەردەوامی ژیانی خەڵك دەگۆڕێت، لەگەڵ مەسەلەی جێگیربوونی شەریعەت هەروەك چۆن چواردە سەدە لە ڕۆژگار بەسەر هاتنە خوارەوەیدا تێپەڕبووە.

ڕاستی ئەم پەرەسەندنە(التطور) چی یە؟ ئایا گشتگیرە بۆ هەموو پێکهاتە مرۆیی و هەموو بوارەکانی ژیانی؟ یان لە نێو دەروونی مرۆڤایەتی و لە واقعی ژیانی ئادەمیزاددا چەند لایەن و بوارێکی جێگیر و هەندێ گۆڕاو هەیە؟

بە شێوەیەکی تایبەت جێگیر(ثابت) و گۆڕاو(متغیر) چین؟ ئایا کارەکان لە کۆتاییدا دەگەڕێنەوە بۆ لای جێگیرەکان یاخود گۆڕاوەکان؟ یاخود بۆ لای هەردووکیان؟ بە چ ڕێگەیەك لە نێوان جێگیر و گۆڕاوەکاندا هاوسەنگی دروست دەبێت؟

ئەم شەریعەتە چۆن هەڵس کەوت دەکات لەگەڵ جێگیر و گۆڕاو لە ژیانی خەڵکدا؟ ئایا هەر بە ڕاستی چەق بەستووە، جێگەی ئەو مەسەلە نوێیانەی لە ژیانی خەڵك دا هاتوونەتە ئاراوە تێدا نابێتەوە؟ یان نەرمی و شلگیریەکی تێدایە وای لێ دەکات نوێیەکان جێگەیان تێدا دەبێتەوە؟ ئەو ڕێکخەرانە چین کرداری هاوسەنگ کردنی جێگیر و گۆڕاو لە مەسەلەکانی ژیانی خەڵك دا دەگرێتە ئەستۆی؟

لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا[1] لە ئەوروپا شتێك دورست بووە دەتوانین

---

مشتومری ماددی کە جیهانی شیوعی بۆ مەسەلەی پەرەسەندن و پێش کەوتن بە تایبەت هێناویە تیە ئاراوە جیاوازیەکە تەنها لە نمرە و پلەدایە نەك لە جۆر.

(١) سەدەی بیستەمی زاینی.

ناوی بنێن(پۆخڵەی پەرەسەندن)، ئەم تیۆری پەرەسەندنەی(دارون)[١] بانگەشەی بۆ کرد زۆر بەتوندی ژیانی ئەوروپیەکانی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا هەژاندو، کاریگەریەکەی تەنها لە بواری زانستی بە تایبەت نەمایەوە کە دارون لێکۆڵینەوەکەی تێدا چڕکردبوویەوە، بەمشێوەیە ئەگەر چی ئەم تیۆرە[٢] بواری لێکۆڵینەوەکەی لەسنووری زانستی ژیان دا بوو بەڵام لەم چوارچێوەیە دەرچوو، بە چەند ئاماژەیەکی ترسناکەوەو شوێنێکی فراوانی لەبیروبۆچووندا داگیرکرد، کەسانێك هەبوو ئەو پێشنیارو گریمانانەیان بە ئەنقەست و بە مەبەست قۆستەوە بۆ تێکشکانی چەمکە بڵاوەکان و، چەمکی نوێیان خستە شوێنی لە بری تاوەکو خزمەت بە کۆمەڵێکی دیاریکراوی خەڵك بکات، بەم شێوەیە گریمانەکانی ئەم تیۆرەو کاریگەریەکانی خزێنرایە بواری بیروباوەڕەوەو هەروەها چووە بواری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵناسی و ئاکاری هونەر و بیروبۆچوون.. کە هەموو ئەم بوارانە بواری یاسادانان و شەرعن.

ئەو بڕیارانەی ئەم تیۆرە -یان باشتر بڵێین گریمانەی زانستی- دای کەوا

---

(١) چارلس دارون زانایەکی بەریتانی یەو پسپۆری زانستی ژیان بووە بانگەشەی بۆ تیۆری پەرەسەندن evolutloh کرد، کە تێدا دەڵێت بوونەوەرە زیندووەکان هەموویان سەرەتا لە زیندەوەرێکی تاك خانەوە بوو کە یەکەم بونەوەری زیندوو بووە لەسەر زەوی پەرەی سەندووە تا گەیشتووە بە مرۆڤ بە چەند قۆناغ و بازنەی جۆراوجۆردا تێپەریوە، لەوانە بێ بڕبڕەکان و ووشکاوەکیەکان و پاشان باڵندەکان و بۆ مەمکدارەکانی دنیا و لە بۆ مەمکدارە بەرزەکان و پاشان بۆ مەیمونەکان، ئینجا بۆ مەیمونە بەرزەکان و پاشان بۆ مرۆڤ( بە گریمانەی ئەوەی بازنەیەکی ون هەیە ئەویش مرۆڤی مەیمونە.

(٢) لە ڕاستیدا ئەمە تەنها گریمانەیەکی زانستی بوو وەك دواتر باسی لێوە دەکەین نەچووە قۆناغی تیۆرەوە.

دروست کراوەکان لە ڕێگەی خودی خۆیانەوە دروست دەبن و هیچ ویستێکی خوداییان[١] لە پشتەوە نی یە و(سروشت) بەدیهێنەرە[٢] هیچ مەبەست و ئامانجی لەم بەدیهێنانەدا نییە[٣]. پەرەسەندن دەگەڕێتەوە بۆ چەند گوشارێکی بارودۆخی ماددی دەوروبەری بونەوەرە زیندووەکەو بونەوەرە زیندووەکە هیچ ویستێك و دەسەڵاتێکی نییە بەرامبەریان[٤].

هەموو ئەمانە -وەك دەبینین- زۆر مەسەلەی تر و فراوانتر لە بازنەی زانستی ژیان لە خۆ دەگرێت، ئەگەرچی داروین خۆی تەنها لەم چوارچێوەو بازنەیەی (زانین)دا بەکاری هێنا بێت بەڵام گریمانەی ئەوەی بەدیهاتن خودی یە[٥]. هێنانە ئارای ئەو گریمانانەی کەوا سروشت توانای بەدیهێنانی هەیە و،

---

(١) داروین دەڵێت: ڕاڤەی گەشە سەندن و دورست بوون(پەرەسەندن) بەوشێوەی ویستێکی خودایی لەپشتەوەیە وەك ئەوە وایە ڕەگەزێکی باڵا دەست بۆ سروشتی دورست بکەین لە بارێکی تەواو میکانیکی دا.
This wmuld be to introduce a supemdtural element in a completely mechanical position.

(٢) داروین دەڵێت: سروشت بەدیهێنەری هەموو شتێکە و سنوور بۆ تواناکانی نی یە لە بەدیهێنان دا.
Nature creates everything and there is no limit to its creativity.

(٣) هەروەها دەڵێت: سروشت کوێرانە هەنگاو دەنێت و کار دەکات. Nature works haphazardy

.

(٤) لەمبارەیەوە سەیری کتێبەکەی(التطور - evolution) کتێبی (اصل الانواع – originof species) بکە لە زۆر جێگای جۆراو جۆری دا هەیە.

(٥) تێبینی دەکەین داروین بەم گریمانەیە نازانستیانەیەی هیچ بەڵگەیەکی بۆ ساغ نەکراوەتەوە لەویدا دەڵێت سروشت بەدیهێنەرەو سروشت کوێرانە هەڵس کەوت دەکات.... کە ئەم گریمانانە بەشێکی بنچینەیی(تیۆرە)کەیەتی! بەڵام لەگەڵ

کوێرانەو بەبێ دانایی و تەگبیر و مەبەست دەجوڵێتەوە، هەموو ئەمانە مەسەلە گەلێکە پەلاماری بیروباوەڕ دەدات و لە بنچینەوە دژایەتی دەکات، لەگەڵ ئەمەشدا بێگومان کار دەکاتە سەر ویژدانی ئەو مرۆڤەی باوەڕی پێ دەکات، چونکە چەمکە تێگەیشتنەکانی و بەهاکانی ژیانی دەگۆڕێت، هەر چۆن هەڵس و کەوت و رەوشتی گۆڕانکاری بەسەردادێت، لێرەدا جیاوازیەکی ئاشکرا بەدی دەکرێت لە نێو ئەو مرۆڤەی باوەڕی بە خودا هەیە کە بەدیهێنەریەتی و بۆ مەبەست و ئامانجێکی دیاری کراو هێناویەتیە بوون و لەبۆ ئەم ئامانجەو بۆ بەدیهێنانی پرۆگرام و نەخشەی بۆ کێشاوە تاوەکو یارمەتی بدات لە دەستەبەرکردنی داو، لە کۆتایی دا لێپرسینەوەی لێ دەکات سەبارەت بەو فەرمانانەی پێی کردووە، لەگەڵ ئەو مرۆڤەی باوەڕی وایە سروشت بەدیهێنەریەتی و بەڕێکەوت و بەبێ مەبەست بەدیهێناوە بەبێ ئەوەی پرۆگرامێکی دیاریکراوی بۆ ژیان بۆ کێشا بێت و هیچ لێپرسینەوەیەکی دەربارەی شتێك لێ ناکات کە جێ بەجێ ی بکات!!﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴾[1].

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴾[2].

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾[1].

---

ئەمەشدا وەك ڕاستیەکی چەسپاو و جێگیر لە بواری زانستی دا بڵاوکرایەوە! هەر چۆن تێبینی دەکرێت چەند تیۆرێکی زانستی نوێ لەبنەڕەتەوە گریمانەکەی ڕەت دەکەنەوە.

(١) سورەتی ص(٢٧-٢٨).

(٢) سورەتی المؤمنون(١١٥).

هەروەها گریمانەی ئەوەی پەرەسەندن  کە بە شێوەیەکی جێگیر بسەپێنرێت - تەنها بە هۆی چەند گوشارێکی ماددی دەوروبەری بوونەوەرە زیندووەکەیە خودا هیچ ویستێکی نیە تێیدا، هەروەها بوونەوە زیندووەکە بە مرۆڤیشەوە هیچ دەسەلات و ویستێکی بەرانبەری نیە، تێڕوانینێکی نوێ بۆ هەواداری دروست دەکات ئەویش باوەڕ هێنانە بە خودایەکی ترو(ماددە) لە هەستەکانی وەك خودا جێگیر دەکات و مرۆڤ دەبێتە بەندەی و، ناچارە حوکم بە یاساکانی بکات و رزگار کاری نیە لە کۆت و زنجیرەکانی و، وای لێ دەکات بەها مەعنەویەکان هیچ بەهایەکی نامێنێت لە ژیاندا، چونکە - گەر باوەڕی پێ بکات- هەستەکانی  دەبێتە رەنگدانەوەی بارودۆخە مادییەکە و دەبێت بەبەرهەمی ئەو بەڕاستەوخۆ یاخود بە ناراستەوخۆ[٢].

لە ڕاستیدا ئەمە ناوکرۆکی ئەو کاریگەریەیە دارونیزم لەبیرو هزری رۆژئاوادا بەجێی هێشت، ئیتر بە ئاگایی خەڵك بووبێت یاخود بە بێ ئەوەی بە خۆیان زانیبێت! کارەکە لە واقیعدا بە هۆی کاریگەری ڕاستەخۆو خێرای بیرۆکەی داریونیزمەوە نەبووە، بەڵکو ئەوەندە بەس بوو کەسێك باوەڕی پێ بکات و لە نێو دەروونی دا گۆڕانێکی گشتگیر بیگرێتەوە، بەڵکو جولەکە هەمیشە لەبۆسەدا بوون  بۆ خراپەکاری(٣)، وەك ئەوەی لەمێژ بێت

---

(١) سورەتی الزمر(٩).

(٢) هەموو زانایان باوەڕیان بەم پەرەسەندنە نیە،هەرچۆن لەنێو ئەوانەی باوەڕیان پێیەتی بەتەواوەتی لەسەر ئەو شێوازەی داروین دایڕشتووە بۆ گریمانەکەی یەکڕا نین و یەکناگرنەوە.

(٣) خـــودا لەوەســـفیاندا دەفـــەرموویێت﴿ وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ سورەتی المائـدە(٦٤) و هـەوڵ دانیـان بـۆ خراپـەکاری و تێکدان وەك سیفەتێکی هەمیشەییان هەژمار دەکات و درێژە پێ دەری دەبن.

چاوەڕوانی ئەم بۆمبە ڕوخێنەرە بووبن و لە هەموو بوارەکانی ژیانەوە هەوڵیان بۆدابێت، لەسەر ئەم بنەما تێوری(زانستی)یانە لە بواری ئابووری و زانستی دەروونی و زانستی کۆمەڵناسی و جۆرەها بواری ترەو کردەوە، هەمووی تەنها بۆ دژایەتی کردنی بیروباوەڕی ئاینی و بەها ئاینیەکان(١)، هەر چۆن بە هۆی دەست گرتن بەسەر شۆرشی پیشەسازیان دا(٢) کۆمەڵگایەکیان لێ دروست بکەن بەبێ ئایین و ڕەوشت و داب و نەریت ئەمەش بۆ جێ بەجێ کردنی پیلانەکەیان ئەویش بە کۆیلەکردنی ئادەمیزاد و مرۆڤایەتی -دوای روخان خراپ کردنیان- تاکو ببنە خزمەتکاری گەلی هەڵبژاردەی خودا(شعب الله المختار) (٣).

---

(١) وەك تیۆری مارکس بۆ ئابوری و تیۆری فرۆید لەبۆ زانستی دەروونی و تیۆری دورکایم لەبۆ زانستی کۆمەڵناسی و ڕێچکەی سارتر(عەبەسیەت) و جگە لەمانە جولەکەی زۆری تر.

(٢) جولەکە هەر لە سەرەتای دروست بوونی شۆرشی پیشەسازی یەوە دەستی بەسەرداگرت لە ڕێگەی قەرزەکانی کە بەسوو دەیداو وای لێ کردن سامانێکی بێ ئەژمار کۆبکەنەوەو کۆکرنەوەی ئالتون و لەرێگەیەوە حوکمی دراوی دەوڵەتانیان کرد ئەمانە پاڵنەر بوون تاوەکو هۆکارەکانی راگەیاندنی جیهانیان قورغ کردو لە ڕێگەی ئەمانەشەوە توانیان دەست بەسەر هەردوو بەرە سەربازییە سیاسیەکە لە یەك کاتدا بگرێت: رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی و حوکمکردنی ئابووری جیهان و هەروەها دەست گرتن بەسەر بیرکردنەوەی خەڵك و هەڵس و کەوت و ڕەوشتیان و ڕێچکەو بیری روخێنەریان بڵاوکردەوەو جۆرەها(شێتی) جۆراو جۆریان لەنێو خەڵكدا بڵاوکردەوە لە شێتی سێکسی و شێتی تۆپی پێ و شێتی(خۆشەویستی و ئالودەبوون و شێتی خۆرازاندنەوەو شێتی سینەما و رادیۆ و تەلەفزیۆن و ڤیدیو.... هتد.

(٣) تلمود دەڵێت (کە جولەکە لە تەورات پیرۆزترە لە لایان) میللەتانی تر(جگە لە جولەکە) گوێدرێژن خودا دروستی کردوون تاوەکو گەلی جولەکە هەڵبژاردەی خودا سەریان بکەون، جولەکەش زۆر باش دەرکی بەوەکرد کەوا تاکە ڕێگا بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بکەن بە گوێدرێژ تێکدانی بیروباوەڕ و رەوشتی و ئیتر مرۆڤ

بەم شێوەیە جولەکە -دەستەڵاتێکیان کرتەوە دەست بە ویستی خودا جیا لەوەی بە هەمیشەیی خودا پەیمانی دابوو پێ یان: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ﴾(١).

ئەم جیاکردنەوەیەش لە خودی خۆیدا بۆ حیکمەتێك هاتووە کە خودا ویستوویەتی: ﴿ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوا إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ اللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ ﴾(٢).

لەوانە ئەمە سزایەك بێت بۆ مرۆڤایەتی لەسەر بێ باوەڕبوونیان و لاف و گەزافیان بەبێ باوەڕیەکەیانەوە: ﴿ قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَىٰ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ﴾(٣).

هەروەها سزایەك بۆ میللەتی موسڵمان بە تایبەت لەبەر ئەوەی زیادە ڕەوییان کردو پشت گوێ خستنیان بەرانبەر پەیامەکە بۆ خۆیان و لە گەیاندنی بە مرۆڤایەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾(٤).

بە هەر حاڵ لێرەدا بوارمان نیە باس لە ڕۆڵی جولەکە بکەین لە بڵاوکردنەوەی داریونیزم و لەوەی کردیان بەسەرچاوەیەك بۆ تێکدانی

---

دەبێت ﴿ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ۝ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ ﴾ خودا بەم شێوەیە لە قورئاندا وەسفی کردوون و ئیتر دوای ئەمە ئاسانە لە بۆ شەیتان و دارودەستەکانی کە چونیان بوێت ئاراستەیان بکەن.

(١) سورەتی الاعراف(١٦٧).

(٢) سورەتی ال عمران(١١٢).

(٣) سورەتی الانعام(٦٥).

(٤) سورەتی البقرة(١٤٣).

بیروباوەڕ و هەڵس و کەوت و بیرکردنەوەکان، بەڵکو لێرەدا دەمانەوێت قسەکانمان چڕبکەینەوە لەسەر بیرۆکەی پەرەسەندن و، کاریگەری لە وروژاندنی ئەو گومانەی کە ناکرێ شەریعەتی ئیسلامی جێ بەجێ و پیادە بکرێت لەلای ئەو موسڵمانانەی هەڵخەڵەتاون لەم هێرشە فیکری یەدا[١].

ئەو هۆکارەی وای کرد هەژانێکی بەهێز لە کاردانەوەی بیرۆکەی پەرەسەندن رووبدات لە ژیانی ئەوروپیەکاندا، ئەوەبوو کە بیرۆکەی کەنیسە باڵادەست بوو بەسەر ئەوروپادا لەسەدەکانی ناوەڕاستدا[٢] باوەڕی بە جێگیربوونی ڕەهای هەموو کەسێك هەبوو هەمیشە بانگەشەی دەکرد کە هەموو شتەکان نەگۆڕە، لێرەدا بیرۆکەی پەرەسەندن ڕێك بۆ رووبەڕووبونەوەی ئەو هاتە ئاراوە، بە شێوەیەك دەرکەوت کە هیچ ڕێگایەك نایان گەیەنێتەوە بەیەك و چار نیە دەبێت یەکێکیان بە تەواوەتی مل بدات و جێگەی بۆ بەرانبەرەکەی چۆڵ بکات، یان جێگیر بوونی تەواوەتی و نەگۆڕان لە هەموو شتێکدا یاخود پەرەسەندنی تەواوەتی و گۆڕان لە هەموو شتێکدا،

---

(١) ئەگەر وویستت لەم بوارەدا روونکردنەوەی زیاتر بزانیت دەربارەی رۆڵی جولەکە لــە تێکــدانی ئــەوروپاو لێپرســراوێتی گــەلانی موســڵمان لــەو بارەیــەوەو ســنوردارکردنی ئــەو دەســتەڵاتە ناکــاوەی جولەکــە لــەم ماوەیــەدا دەیبێــت بڕوانە(مذاهب فكرية معاصرة) بەشی(دور اليهود في افساد اوروبا).

(٢) ئەوروپا بەسەدەکانی ناوەڕاست دەڵێت(سەدە تاریکەکانی ناوەڕاست) لەم وەسـفەدا زۆر پڕ بە خۆیەتی بەڵام تەنها لە ئەوروپادا تاریك بوو چونکە لەو کات جیهـانی ئیسلامی لە زێـرینترین و پـێش کـەوتوترین مـاوەی دا بـوو لـە زانسـت و زانـین و دڵنیـایی، ئــەوروپا هۆکــاری تاریکســتانیەکەی ســەدەکانی ناوەڕاســت دەکاتــە ملی(ئایین) لەمـەدا ڕاسـت دەکات ئـەو ئاینـە دەسـتکاری کـراوەی هـەیبوو نـەوەك خودی ئایین بە گشتی بەو شێوەی فریودراوەکان بە هێرشی فیکـری بـۆی چـوون چونکە(ئایین) سەرچاوەو چاوگەی رووناکی بوو لەو ماوەدا بۆ موسڵمانان.

ڕێگەی سێ یەم نی یە! کەنیسە کە بیرۆکەی نەگۆڕی و جێگیری هەڵگرتبوو هەر لە سەدەی شانزەهەمەوە ووردە ووردە لە رووخان دابوو، دەستەڵاتی بەرەو لاوازی دەچوو لەو کاتەی(ڕاپەڕین) لەسەر بنەمای دژ بە ئایین و دژایەتی کردنیان بۆی دەستەڵاتی زانستی و عیلمانی کە بیرۆکەی پەرەسەندنی هەڵگرتبوو بە بەردەوامی لە ژیانی ئەوروپا لە زیاد بوون دا بو، روانگەی رووداوەکان ئاماژەیان بەوە دەکرد کە جێگیربوون و نەگۆڕی لە هەموو شتێکدا دەبێت بە تێکشکاوی گۆڕەپان چۆڵ بکات تاوەکو بیرۆکەی پەرەسەندنی ڕەها لە هەموو شتێکدا جێگەی بگرێتەوە، هیچ جیاوازی نەبوو ئەگەر(پەرەسەندن)ی پێ قبووڵ بکرێت یان توانای گۆڕینی نەبێت!

بێگومان کەنیسە لە هەموو بیروبۆچوونەکانیشیدا هەر لەسەر هەڵە نەبوو ئەگەر چی لە زۆر شتدا لەسەر حەق نەبوو. بیروباوەڕی نەگۆڕ لە مەسەلەی خودایەتی دا بیروباوەڕێکی ڕاستە ئەگەرچی کەنیسە لەم مەسەلەیەدا بەهەڵەداچوو بوو، باوەڕی وابوو خودا سێ خودایەو مەسەلەی بە خودا کردنی عیسا و هەروەها دەیانووت خودا کچی هەیە -پاك و بێگەردی بۆ خودا- کە زیندوو و هەمیشەیی و ئەزەلیە و زاتی پاکی ناگۆڕێت و ناگۆردرێت و هیچ لە ناوو سیفەتەکانی جێگەی گۆڕانکاری نیە، هەروەها بیروباوەڕی نەگۆڕ سەبارەت بە مەسەلەی دروستکردنی بەو مانایەی خودا بەدیهێنەرو دروست کارە تەواوەو حەقەو هەموو شتەکان بەدیهێنراوی ئەون و هەر خۆی سەرو کاری کارەکانیان دەکات و، بەڕێوەی دەبات و هەڵسوڕێنەری هەموو شتێکەو هەروەها ئەو بۆچوونەی خودا مرۆڤی هێناوەتە سەر زەوی بەو واتایەی خۆی بەدیهێنان و دابەزاندن بۆ سەر زەوی تاوەکو ماوەیەکی دیاری کراوی تێدا بباتە سەرو کارێکی گرنگ و دیاری کراوی تێدا ئەنجام بدات، پاشان دەمرێت و زیندووی دەکاتەوە، لێپرسینەوەی لەسەر ئەو کارانەی لە دونیادا ئەنجامی داوە لەگەڵ

دەگرێت، پاشان بە نەمری لە لای خودا دەمێنێتەوە ئیتر یان لە بەهەشت یاخود لە دۆزەخ.

بەڵام تێڕوانینی کەنیسە نەیپێکابوو لەوەی خولگەو ئەستێرە ئاسمانیەکان هەموو ئەو شتانەی لە زەوی دا هەن لە داڕشتەو ئەندازە و قۆناغەکان هەموویان جێگیرو نەگۆڕن ئیتر گەر سیاسی یان ئابووری یاخود کۆمەڵایەتی بووبێت... ئەم تێروانینە ڕاست و هۆشیارانە نەبوو، زۆربەیان وەك جێبەجێ کردنی بۆ سوونەتە پەروەردگارییەکانیان دەگەڕاندەوە، لەو لایشەوە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوروپا لە زانستە گەردوونیەکاندا لە پاش بوو.

هەرچونێك بووبێت ئەم بیرکردنەوانە باڵا دەست و بڵاوبوون بە هەڵە و ڕاستەکانیانەوە بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست هەتا بەهۆی تێکەڵاویکردنی ئەوروپاییەکان لەگەڵ موسڵمان و پێکەوە ژیانیان ئیتر ئەگەر تێکەڵاویەکە ئاشتیانە بووبێت لە گۆڕینەوەی زانستی موسڵمانان و رۆشنبیریان و شارستانیان لە ئەندەلوسەوە بۆ ئەوروپا لەڕێگەی نێردراوە ئەوروپیەکان کە منداڵەکانین دەنارد بۆ فێربوونی زانست و پاشان ئەو پەرتوکە عەرەبیانەی وەرگێڕا بۆ لاتینی و ئەغریقی، یاخود ئەگەر تێکەڵاو بوونەکە بەهۆی جەنگی خاچ پەرستەکانەوە بووە کە ئەوروپا پێشەوایەتی دەکرد بۆ سەر موسڵمانان لە رۆژهەڵات هەتا وایان کرد ڕاپەرینی ئەوروپا دەست پێ بکات.

لە دەرئەنجامی چەند بارودۆخێکی زۆر ئاڵۆز و لێك ئاڵاو کە بواری درێژەپێدان و باس لەسەر کردنیمان لێرەدا نییە[1]. ئەوروپا توانی زانستەکانی موسڵمانان و شارستانیەتەکەیان لێوە وەربگرێت بەبێ ئەوەی ئایینی ئیسلام وەربگرێت شارستانیەتێکی دژ بە ئایین لە لایان دروست بوو، یان دەتوانین

---

(١) بروانە(مذاهب فكرية معاصرة) بەشی(العلمانية) هەورەها بروانە کتێبی(العلمانيـة)ی سفر عبدالرحمن الحوالي.

بڵێین دوور لە ئایین و، نەیدەویست لە هیچ مەسەلەیەکی ژیان دا بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارو پێی باشتر بوو بیگەڕێنێتەوە بۆ سەر زانستە مرۆییەکان[1].

کاتێك داروین بانگەشەی بۆ تیۆرەکەی کرد هێشتا بیرو بیرکردنەوەی ئەوروپی لە ئامادە باشی دا نەبوو بە هەموو لایەنو ئاماژەکانیەوە قبوڵی بکات، بە تایبەتی کە(مرۆڤ) لە هەموو رێز و کەرامەتێکی دا دەماڵێ و، دەیگەڕێنێتەوە بۆ بنەڕەتێکی ئاژەڵی رووت و هیچی بۆ ناهێڵێتەوە مایەی شانازی و جیاکرنەوە بێت بۆی و، دەیکاتە بونەوەرێك لە نێو بونەوەرەکانی تردا بە ڕێگەی رێکەوت هاتۆتە سەر زەوی، بەڵێ پەرەی سەندوە! بەلام لەگەڵ ئەمەشدا هەر ئاژەڵە! یان وەك یەکێك لە داریونیەکان ناوی لێ دەنێن(مەیمونی لووس the hairless ape) واتە ئەو مەیمونەی جەستەی بەموو دانەپۆشراوەو لووسە!

ئەوروپا داریونیزمی قبوڵ کرد لە کاتێکدا هێشتا و لە سەرەتادا دوو دڵ بوو لێی، بەلام ووردە ووردە دوو دڵی و سڵەمینەوەکەی کەم بوویەوەو، تا لە کۆتاییدا گۆڕا بۆ پەرۆشیەکی هەژاوو و بە کوڵ و بەهیچ شێومیەك بواری بۆ جێگیر(ثابت) نەهێشتەوەو کردیە گۆڕاوی ڕەها.... نە بۆ ئایین و نە بۆ رەوشت و نە بۆ داب و نەریت و بەهاو بیرو بۆچوونەکان نەهێشتەوەو، وەك ئەوەی زۆر لەمێژ بێت قەناعەتی بەوە کردبێت هیچ شتێك لە گەردوونی ماددی دا جێگیر نیە... نە ئەستێرە ئاسمانیەکان و نە بونەوەرەکانی سەر زەوی لە رووەك و ئاژەڵ.. یان مرۆڤ!!

---

(١) (زانستە مرۆییەکان) سەرچاوە بوون لە ئەوروپا واتە ئەو زانیاری و زانستانەی لە لایەنی مرۆڤەوە دێن نەك لە نیگای پەروەردگارەوە! بەم شێوەیە لە یەکەم چرکەی دروست بوونیەوە دژ بە ئایین چاوی بە دونیا هەڵهێنا.

لە پشت ئەو وەرگەرانە خێرایەی کە لە ماوەی چەند ساڵێکی کەم لە رۆژگار رووی دا چەند هۆکارێك هەبوو...

شۆرشی فەرەنسا چەند بارودۆخێك لە ئەورووپاداو لە چەند وولاتێکی جیهاندا کە هەزارەها ساڵ بوو جێگیر بووبوون هێنایە لەرزەو هەژاندی و لەقی کرد. هەروەها شۆرشی پیشەسازی چەند بارودۆخ و مەسەلەیەکی هەژاندو جێ لەقی کرد کە هەزارەها ساڵ پێشتر نەگۆرکرابوو لەو کاتەوەی خەڵك فێری کشتوکاڵ بووبوون لەسەری ژیا بوون، بەم شێوەیە کشتوکاڵ کرایە شتێکی پەراوێزخراو و لاوەکی لە ژیانی خەڵك داو هەموو هەوڵ و بایەخەکان بۆ بەرهەمی پیشەسازی زیاتر چرکرانەوە ئەو ئافرەتەی چەند سەدەیەکی دووورودرێژ لە ژیانی مرۆڤایەتی لە ماڵەوە خەریکی کاروباری ماڵ و منداڵەکانی بوو چووە دەرەوە بۆ کارکردن لە کارگەکانداو لە دەرئەنجامی ئەمەش(مەسەلەیەك)ی هێنایە ئاراوە کە زیاتر لە سەدەیەك مرۆڤایەتی سەر قاڵ کرد[1].

لە پشت هەموو ئەمانەوە هەمیشە جوولەکە لە بۆسەدا بوو بۆ خراپەکاری و هەموو هەلێك بهاتایەتە پێشیان دەیانقۆستەوە تاوەکو خراپەکاری لەسەر زەوی دا بچێنن و، داریونیزمیان قۆستەوە بە ئامازەو داواکاریەکانیەوە تاوەکو هەموو بەها جێگیرەکانی ژیانی مرۆڤی پێ لە ناو ببەن! لە لایەکی ترەوە ئەو نەفرەت و هەڵهاتنەیان لە کەنیسە بە هەلزانی و قۆستیانەوە بۆ لە ناوبردنی

---

(١) ئەگەر وویستت سەبارەت بە دورست بوونی(قضية المرأة) لە ئەورووپاو ئەو کاریگەریانەی کردیە سەر کۆمەڵگای ئەورووپی بروانە(دور اليهود في إفساد أوروبا) لە کتێبی(مذاهب فكرية معاصرة).

هەموو شتێك كە پەیوەست بێت بە ئاینەوە![1].

لێرەدا نامانەوێ بچینە نێو گفتوگۆ و مشت و مڕی زانستی لەگەڵ داریونیزم دا ئەمە واز لێ دەهێنین بۆ خاوەن پسپۆڕان و تایبەتمەند[2]. ئەگەر چی سەرنجی خوێنەر لە جیهانی داریونیزم دا رادەکێشین بۆ لای ئەو زانایەی(داریونیزمی هاوچەرخ) ناو دەنرێت ئەویش(جولیان هكسلی) كە neo darwinism لە كتێبەكەیدا(الانسان في العالم الحديث man in the modern warld) دەڵێت: مرۆڤ لە هەموو بونەوەرەكانی تر جیاوازە تەنانەت پێكهاتەی(بیولوجی) لە خۆیدا جیایە جگە لەوەی پێكهاتەی عەقڵی و دەروونی تاكەو بێ وێنە لە نێو بونەوەرەكانی تردا[3].

ئەگەرچی لێرەدا ناچینە نێو مشت و مڕی زانستی لەگەڵ تیۆری دارون دا، دەڵێین زانست لەم رۆژگارەدا زۆر پێش كەوتنی بەخۆیەوە بینیوە تا سەردەمی دارون و زانایان( بەتایبەت لە دوای تەقاندنەوەی ئەتۆم و پاشان تەقاندنەوەی ناوكەكەی) بۆیان دەركەوت كەوا چەند یاساو سوننەتێكی نەگۆڕ لە گەردوون دا هەیە ئەگەرچی هەمیشە لە شێوازو شێوەدا گۆڕانكاری بەسەردابێت ئەمەش بە تەواوەتی لەلای دارون روون نەبووەو ڕاستە ئەگەر بڵێین یاساكانی

---

(١) دووبارە بڕوانە(مـذاهب فكريـة معاصـرة) دەسـتپێكی یەكـەمی(دور الكنيسـة) و دەستپێكی دووەمی(دور اليهود في إفساد اوروبا).

(٢) پێشـتر باسمـان لێوە كـرد كـە گریمانـەكانی دارون بـە سـەلامەتی لـە لای زانایـان دەرنەچوو وە زۆرێـك لـە زانایـان بـە تـەواوەتی ڕەتیـان كـردەوە هەنـدێكیان بـە دیوێكی دی جیا لە دیدو تێڕوانینەكانی دارون لێكیان داوەتەوە بـۆ نمونـە بڕوانـە كتێبی(موریس بوكای(اصل الانسان) وەرگێرانی مكتب التربية الخليجي.

(٣) بڕوانـە: جولیـان هكسلی(الانسـان في العـالم الحـديث) وەرگێرانـی حسـن خطـاب و پێداچوونەوەی د. عبدالحليم منتصر لە بەشی(تفـرد الانسان) لـە بڵاوكراوەكانی پرۆژەی هەزار كتێب دا وەزارەتی خوێندنی باڵا لە قاهیرە – ١٩٥٦.

پەرەسەندن و سونەتەکانی دۆزیبێتەوە بەڵام نەیتوانیوە سووننەت و یاسا نەگۆڕەکان بدۆزێتەوە کە پەرەسەندن لە چوار چێوەیاندا روودەدات بەڵکو - لەبەر نەزانینی دەڵێت(سروشت) هەنگاوی کوێرانە دەنێت!

زانایان بۆیان دەرکەوت کەوا چەند رێکخەرێکی جێگیرو نەگۆڕ لە بنیات نانی هەموو گەردوون دا هەیە، خۆی لە پێکهاتنی ئەتۆم دا دەبینێتەوە لە ناوکی موجەب و کارەبا سالبەکەی بە خێراییەکی دیاری کراوو بە دەوری دا دەخولێتەوە جیاوازی لە نێوان توخمێك و توخمێکی تردا هیچ جیاواز نین لەم رێکخەرە نەگۆڕانەدا بەڵکو جیاوازیەکە تەنها لە ژمارەی ئەو یەکانەدایە کە ئەتۆمی هەر توخمێکی لێ دروست بووە وە چەندەها گۆڕانی زۆر لە گەردوون داو بە درێژایی ملیۆنەها ساڵ رووی داوە بەڵام ئەم رێکخەرە نەگۆڕانەی نەگرتۆتەوەو نەگۆڕاون تەنانەت ئەو رێگایانەی گۆڕانکاریەکەی پێ جێ بەجێ کراوە لە بارێك بۆ بارێکی دی و لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی دی ماددەکەی بە شێوازێکی تر نەگۆڕیووە.. لە پشت هەموو ئەمانەوەو حوکم کردنی رێکخەرە نەگۆڕەکان و زاڵ بوون و حوکم کردنی رێگەی گۆڕانەکە هێزێکی باڵا دەست و بەڕێوەبەر هەیە[١].

هەروەك زانایانی زیندەوەرزانی نهێنیەکانی خانەی زیندەوەریان بۆ روون بوویەوەو دۆزیانەوەو، گەیاندنی بەو قەناعەتەی چەند یاسایەکی جێگیر لە کرداری گۆڕانکاریەکانی بنیات نانی خانەدا هەیەو، گۆڕانکاریەکان کوێرانە نیە[٢].

---

(١) بڕوانە کتێبی(a brief history of time) زانای ئەمریکی هۆکنج(hoking) لە وویلایەتە یەکگرتومکان لە چاپ دراوەو لە چاپخانەی bantam ابریل ١٩٨٨.

(٢) بڕوانە مۆریس بۆکای(اصل الانسان) پێشتر ئاماژەی پێ کرا.

کەواتە ئەمە وێنە ڕاستەکەیە کە زانست پێی گەیشتووە، یاسای نەگۆڕو شێوازی گۆڕاو یان بڵێ: شێوەی گۆڕاو بە دەوری چەقی نەگۆڕدا دەخولێتەوە، ئەگەر دارون بگەیشتایە بەم ڕاستیە ئەوا مەسەلەکەی یەکلادەکردەوەو هەل و دەرفەتی بۆ جولەکە بەجێ نەدەهێلاّ تاوەکو بەهۆی داریونیزمەوە خراپەکاری لەسەر زەوی بلاّوبکەنەوە[(١)].

بەلاّم ئەوەی بۆ بیرۆکەی دارونیزم رووی دا هەر گەشەی دەکردو فراوان دەبوو هەتا هەموو بوارەکانی لێکۆڵینەوەی داپۆشی و گرتەوە، لە نێوانیاندا(لێکۆڵینەوە مێژوویی، زانستی کۆمەڵناسی و دەربارەی ڕاڤەی جەدەلی بۆ مێژووەو[(٢)] وترا هەروەك لە زانستی کۆمەڵناسی دا وترا: بە شێوەیەکی ڕەها نەگۆڕ(ثابت) لە ژیانی مرۆڤ دا نیە وە دورکایم دەڵێت[(٣)]: (وا گومان دەبرا کەوا ئایین و هاوسەرگیری و خێزان لەو شتانەن لە فیترەتدا هەبوون[(٤)] بەلاّم لێکۆڵینەوەیەك بۆت دەردەخات، کە ئەمە لە ڕاستیەوە دوورە! [(٥)]

---

(١) لە پرۆتۆکۆلی چوارەم داهاتووە لە(بروتوكولات حكماء صهيون): ئێمە سەرکەوتنی(دارون و نیتشە)مان ڕێکخست و بێ گومان کاریگەری ئەم دوو بیرۆکەیەمان لەسەر بیروباوەڕی ئومەمیەکان لە لامان ئاشکراو روونە.

(٢) ناسراو بە ناوی(ڕاڤەی ماددی بۆ مێژوو).

(٣) إمیل دورکایم زانایەکی کۆمەڵناسی جولەکەیە(١٨٥٨-١٩١٧) گەورەترین جێگە دەستی هەیە لە دیراسە هاوچەرخەکانی زانستی کۆمەڵناسی بەداخەوە زاناکانی کۆمەڵناسی بەبێ هیچ سانسۆرێك شتەکانی لێوەردەگرن!.

(٤) واتە ئەو شتانەی سیفەتی نەگۆڕیان هەیە.

(٥) بڕوانە دورکایم(مقدمة في علم الاجتماع) وەرگێڕانی د. محمود قاسم لە دەرکردنی ادارة الترجمة لە وەزارەتی تعليم العالي قاهرە ط٢، ص١٧٣، هەر لەم

لەنێو ئەوانەی کە وتران ووترا، مرۆڤایەتی بەسێ قۆناغدا تێپەڕیوە: قۆناغی جادووگەری، پاشان قۆناغی ئاینداری و پاشان قۆناغی زانست! هەر چۆن جادوو جێگەی بۆ ئایین چۆڵکرد ئاینیش جێگەی بۆ زانست چۆڵ کرد!

واز لەو کاتەی ئەورووپاو، شێوان و ناتەواوی یە فیکری یەکانی ئەو سەردەمانەی بێنە، بەڵکو لەو کاتەوە باسی لێوە دەکەین کە ئایینی کەنیسەی دەستکاری کراو کاربەدەست بوو تا گەیشت بە یاخیبوون و کودەتا بەسەر ئایندا و عەلمانیەت وەك پرۆگرامێك بۆ دیدو بۆچوون وپرۆگرامی ژیان وەرگیراو، بانگەشەی پەرەسەندن و پێشکەوتنخوازی و بێ ئایینی بڵاوەی کرد و هەر تێڕوانینێك بۆ بوونی شتی نەگۆڕ(ثابت) بە کۆنەپەرستی و دواکەوتی ناو دەبراو، هەموو پەرەسەندن و پێشکەوتنیان بە پێشکەوتن و بڵندی و سەردەمیانە دەزانی...

**لێرەدا واز دەهێنین و دەچینەوە سەر جیهانی ئیسلامیی.**

بیرو بۆچوونی ئیسلامیی، کە سەرچاوەکەی بە قورئان رێنمویی کراوەو، بە رووناکی سوننەتەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پرشنگدار کراوە، ئەو شێوان و ناتەواویانەی تووشی فیکری ئەورووپی هاتبووتوشی نەهات، بەتایبەت لەم مەسەلەی ئێستاماندا، کە باسی لێوە دەکەین، رۆشنبیرو زانایانی موسڵمان بە هیچ شێوەیەك وای بۆ نەچوون بە شێوەیەکی رەها هەموو شتێك جێگیرو نەگۆڕە، یاخود بە شێوەیەکی رەها هەموو شتێك گۆڕاوە بەڵکو هەمیشە بۆچوونیان وابووە کە چەند شتانێك هەن نەگۆڕن و هەندێکی دیش گۆڕاوە بە تایبەت لە ژیانی مرۆڤ دا.

---

کتێبەدا(ص٥٩-٦٠) ئەگەر تەماشای بەهارەو شتەکان بکەین کەوا بەهای جێگیرو نەگۆرە تیروانینێکی نازانستی یە بەهەموو شێوەیەك.

مەسەلەی ئیجتهاد لە شەریعەت دا بەرجەستە کردنێکی واقعی ئەم دیدو بۆچوونەیە.

بارودۆخی ژیان بەردەوام لە گۆڕان دایەو زانایانیش لە ئیجتهاد کردنن بۆ ئەوانەی دەق لە بارەیانەوە نیە، بەڵام هەمیشە ئەم ئیجتهادانەیان بە چەند رێکخەرێکی نەگۆڕەوە بەندە، کە پێی دەوترێ مەبەستەکانی شەریعەت(مقاصد الشریعه).

پێش ئەوەی بچینە سەر باسی شەریعەت و مەسەلەی ئیجتهاد دەپرسین چی لە پێکهاتەی مرۆیی و ئادەمیزاد دا جێگیرو نەگۆڕەو چی گۆڕاوە؟

ئایا ڕاستە مرۆڤ خاوەنی هیچ بوونێکی نەگۆڕ و فیترەت نیە؟ بەڵکو تەنها کاردانەوەیەکی ژیانی ماددی دەوروبەریەتی و، هەر لەو کاتەوە گۆڕانێکی ریشەیی بەسەردا هاتووە تا گەیشتووە بەم رۆژە، لە هەموو قۆناغێکی ماددی تێپەڕاندووە، کرۆك و ناوەڕۆکی بە تەواوەی جیاواز بووە لەوەی لە قۆناغی پێشوودا هەیبوە، هەروەها مرۆڤی(چاخی پیشەسازی) بونەوەرێکی تەواو جیایە لە مرۆڤی چاخی کشتوکاڵی، چی بگات بە مرۆڤی شوانکارەیی و پێشتریش مرۆڤی ئەشکەوت نشین؟

**(رینیە دۆبۆ) لە کتێبەکەیدا(انسانیه الانسان) دا دەڵێت:**

مرۆڤی کراماگنۆن cra-magnon پێش نزیکەی سێ هەزار ساڵ لە زۆربەی شوێنەکانی ئەوروپادا ژیاوە ماوەیەکی زۆر پێش سەردەمی کشتوکاڵی و ژیانی نیشتەجێ بوون لە لادێ کاندا. لەگەڵ ئەوەشدا ڕاوچی یەتی کاری سەرەکیان بووە، بەو شێوەیەی دەردەکەوێت بە تەواوەتی لە رووی جەستەو هزر(عقل)ەوە لە یەك چوون ئەو ئامێرو چەکانە هەمووی ئێستا گونجاون لەگەڵ دەستەکانی ئێمە داو ئەو شێوەی لە ئەشکەوت نشین پەنای بۆ بردووە هەستەکانمان دەجوڵێنێت و، لە لایەکی ترەوە ئەو بایەخەی بە ناشتنی

مردووەکانیان داوەو ڕەچاویان کردووە بە شێوەیەك لە شێوەکان بەشداریان کردووین لە گرنگی دان بە مرۆڤ و کۆتاییەکەی، هەموو ئەو شوێنەوارە نوسراوانەی پێش مێژوو مرۆڤەکان بەجێیان هێشتووە گەواهی دەری ئەو بیرۆکەیەن کە دەڵێت تایبەتمەندیە بنەڕەتیەکانی ڕەگەزی مرۆیی لە چاخی بەردینەوە نەگۆڕاوە[1].

## با تەماشا بکەین بزانین چی لە ژیانی مرۆڤدا گۆڕاوە..

مرۆڤ لە نێو ئەشکەوتەکاندا دەژیا پاشان کەپرو زنج و خانووی لە قوڕ دروست کردو پاشان خانوو و باڵەخانە و تەلاری دروست کرد.. لە داهاتوو خانوو لەسەر هەسارەکانی دی یان لەنێو کەشتیە ئاسمانیەکانیشدا دروست دەکات!

مرۆڤ پێشتر بە گەڵای دارەکان و پەڕی گیانداران خۆی دادەپۆشی، پاشان بە چنینی دەستکردی خۆی و جل و بەرگی‌میللی دروست کرد، پاشتر بە ڕێگەی چنینی بە ئامێر دروستی کردو هونەری جل و بەرگ بەرەو پێشتر چوو(مۆدە)ی بۆ دانراو داب و نەریت بۆ مۆدەکان ڕێکخرا...

پێش ئەوەی ئاگر بدۆزرێتەوەخواردنی بە کاڵی و نەکوڵاوی دەخوارد، دواتر کوڵاندنی پاشتر هونەر سازی لە دروست کردنی داهێناو ئامێری بۆ هێنایەکایەوەو داب و نەریتی بۆ دانا...

ژیان پشتی بە ڕاوکردن دەبەست، پاشان مرۆڤ دەستی کرد بە بەخێوکردنی گیاندارو بوو بە ژیانی شوانکارەیی، پاش ئەوە ژیانی کشتوکاڵی دوایی دۆزینەوەی کشتوکاڵ، پاشتر پیشەسازی لە دوایی داهێنانی ئامێر، لە داهاتوو

---

(١) رینیە دۆبۆ، إنسانیة الانسان وەرگێرانی د. نبیل صبحي الطویـل دەزگای الرسـالة لە بەیروت چاپی ١، ١٩٧٩ ل٧١.

شێوازی زۆر لەمانەی باسمان کرد نوێ تر دێتەکایەوە.

مرۆڤ ئەگەر بیویستایە لە شوێنێکەوە بچێت بۆ شوێنێکی تر بەپێ دەرۆیشتن یان بۆ پەرینەوە لە ئاو چەند تەختەیەکی پێکەوە لێك دەداو پێی دەپەڕیەوە، پاش ئەوە گیاندارانی بارهەڵگری بەکارهێنا لەگەڵ کەشتی پەردەدار داو، پاشتر ئۆتۆمبێل و کەشتیەگەلی داهێناو دواتر بەفرۆکە و موشەك گەشتی کرد.

مرۆڤ تاکێك بوو لە خێزانێکدا، پاشتر بوو بە تاکی هۆزێك و، پاشتر بووە تاکی کۆمەڵگایەك لە چەند هۆزێك پێکهاتووە و، دوایی ئەوە بووە تاکی میللەتێك و، ئینجا بۆ نێو کۆمەڵگاو نێو دەوڵەتی چەند لایەنە کە هەریەك جیاوازن لەوی تر، پاشان بوو بە تاکی کۆمەڵگایەك پێی دەوترێت کۆمەڵگەی مرۆیی (مجتمع إنسانی)[(١)] لایەنەکانی بە کرداری لێك نزیك بونەوەو هۆکارەکانی پەیوەندی کرد پەرەی سەندو تا دونیا گەیشتە ئەو رادەی وەك یەك لادێی لێ هات!

بەڵێ هەموو شێوازەکانی ژیان گۆڕا بەڵام چی لە پێکهاتەو بوونی لە ناخەوە گۆڕاوە؟

ئایا وویستی بۆ مانەوەی هەتا هەتایی گۆڕا؟ حەزی بۆ درێژەپێدان و مانەوە لە رێگەی نەوە خستنەوە گۆڕا؟ حەزەکانی بۆ بیناسازی و

---

(١) ئەو کۆمەڵگایەی ناودەنرێت(المجتمع الانسانی) ئەوەیە کە درندەترین شێوازەکانی کۆمەڵ کوژی و جۆرەها دوژمنکاری تێدا رووی دا، هەندێکی لەوپەری خۆش گوزەرانی یەکی بێ کۆتا و هەندێکی تر لە هەژاریەکی قڕکەردا دەژی هەندێکی خۆراکەکانی دەکاتە دەریاو روبارەکانەوە یان دەیسوتێنێ تاوەکو نرخی لە بازاری جیهانی دا نەشکێت، هەندێکیش لەتێك نانی دەست ناکەوێت لە لەناوچوون رزگاری بکات.

ئاوەدانکردنەوەو بنیات نان و گۆڕانکاری گۆڕا؟ حەزەکانی بۆ دروست کردنی میوانخانەو دوکان و بەرەوپێش بردنی ئامێرەکان و رازاندنەوەی ژیان؟ حەزەکانی بۆ خۆ دەرخستن و چەسپاندنی خود؟ حەزەکانی بۆ خاوەندارێتی[1]؟ بۆ خودی خۆی خۆپەرستی لە هەمان کاتدا حەزکردنی لە ژیان بەسەربردن لە نێو کەسانی تردا؟ ئایا تەماحەکانی گۆڕا؟ ئایا ئاواتەکانی گۆڕا؟

**بەکورتی: ئایا(پاڵنەرە لاوەکیەکانی) گۆڕا؟**

ئایا گۆڕا، پێش ئەمانە هەمووی و، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا مرۆڤ لە -هەموو بارودۆخ و قۆناغەکان و چاخەکاندا -جیاکەرەوەی (ناوەڕۆك)ی لە تێروانین و رەوشتیان دا هەبووە یەکێك لەم دووانە بووە: یان بێ باوەڕ یاخود ئیماندار. یان شوێن کەوتەی پرۆگرامی خودا بوو یاخود شوێن کەوتەی پرۆگرامی شەیتان بوون.

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ﴾[2].

﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾

---

(١) شیوعیەت بانگەشەیەکی گەرمی کرد بۆ ئەوەی کەوا وویست و حەزی خاوەندارێتی(حب التملك) پاڵنەرەکەی لە ناخ و فیترەتی مرۆڤەوە نی یە، بەڵکو مرۆڤ لە کاتی پەرەسەندنی قۆناغە ماددیەکانداو دوایی دۆزینەوەی کشتوکاڵ بۆی دروست بووەو پاش ئەوە لە سەردەمەکانی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری دا بەردەوام بووە لەگەڵیدا دواتر شیوعیەت هاتووەو بەرەنگاری بۆتەوەو شوێنەواری نەهێڵاوە! پاشان شیوعیەت لە گۆڕنراو ئەم بانگەشانەیش لەگەڵیدا نێژران!

(٢) سورەتی التغابن(٢).

﴿إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴾(١).

ئایا کاتێك شێوازەکانی ژیانی بە درێژایی مێژوو گۆڕانکاری بەسەرداهات هیچ گۆڕانێکی ڕاستەقینە لە قوڵایی و لە ناخیدا ڕووی دا؟

جیاوازی ناوەڕۆك لە ڕاستیدا لەنێو مرۆڤی شوانکارەو مرۆڤی کشتوکاڵی و مرۆڤی پیشەسازی و مرۆڤی ئەتۆمی دا نیە! بەڵکو لە نێو شوانکارەیەکی ئیماندارو بێ باوەڕداو لە نێو کشتوکاڵیەکی باوەڕدارو بێ باوەڕو مرۆڤێکی ئەتۆمی بێ باوەڕو باوەڕدار دایە! بەڵام ئەو جیاوازیە لاوەکیانە ـ ڕووکەشیانە ـ لەنێو شوانکارەیی و کشتوکاڵی و پیشەسازی دا هەبوون وەك وتمان جیاوازی بوون لە شێوازو ڕووکەش داو لە ناخ و بوونی دا نەبوو.

ئایا ئەمە مانای ئەوەیە ئیتر بە هیچ جۆرێك گرنگی بە گۆڕینی شێوەو شێواز نەدەین چونکە ناوەڕۆکیان نەگۆڕیوە؟

نەخێر کەس ئەم مەبەستەی نیە! چونکە گەر وا بوترێ مانای هەڵوەشاندنەوەی(مێژوو) و هەموو ئەو هەوڵ و کۆششانەی مرۆڤ کێشاویەتی بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی. مانای هەڵوەشاندنەوەی ڕۆڵی ئەو(جێنشین) کردنەیە مرۆڤی لە پێناویدا دروست کردووە، لەنێو ئەوانەی کە دەیگرێتەوە ئاوەدان کردنەوەی زەوی یە بە پەیڕەوکردن و لە داواکراوەکانی پرۆگرامی پەروەردگارە:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾(٢).

﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴾(١).

---

(١) سورەتی المعارج(١٩-٢٢).

(٢) سورەتی البقرة(٣٠).

﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦ ﴾[٢].

﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ ﴾[٣].

**لە میانەی جوڵەی مرۆڤ لەسەر زەوی و تێکەڵ بوونی لەگەڵ ئەم گەردوونە ماددی و، هەوڵ و کۆشش کردنی بۆ دەست گرتن بەسەر وزەکانیدا.. شێوازەکانی ژیان نەوە لە دوای نەوەو، سەدە لە دوای سەدە لە گۆڕان دایە. ئەگەر ئەمە هەڵبوەشێنینەوە گوایە تەنها لە ڕوخسارو رووکەشدایە، ئەوا لەگەڵیدا یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانمان لە بوونی مرۆڤایەتی هەڵدەوشێنینەوەو پێوانەکانی بەردەستمان لارسەنگ دەبن.**

**بۆچی ئەم مەسەلەیە دروست بکەین لە کاتێکدا ئێمە ناتوانین نەگۆڕەکان(الثوابت) پشت گوێ بخەین‌و لەهەمان کاتدا ناتوانین گۆڕاوەکانیش(المتغیرات) پشت گوێ بخەین؟**

**کەنیسە لەم تێروانینەیان کە جەختی لەسەر نەگۆڕاوەکان بە تەنهاو پشت گوێ خستنی گۆڕاوەکان دەکرد و هیچ بایەخێکیان پێ نەدا هەڵە بوو.**

**بیرو دیدی(پەرەسەندن – التطور)ی هەڵقوڵاوی داریونیزم بە سیفەتێکی تایبەت کە جەختی لە گۆڕاوەکان بە تەنها دەکردو بەها نەگۆڕەکانی پشت گوێ خستبوو و هیچ بایەخێکی پێ نەدەدا هەر هەڵە بوو.**

**ڕاستیەکەی ئەوەیە نە ئەمەیان و نە ئەویان پشت گوێ نەخەین چونکە هەر یەکەیان شوێنەواری ڕوون و ئاشکرای لە ژیانی مرۆڤدا هەیە.**

**بەڵام ئەو پرسیارەی کێشەکە یەکلا دەکاتەوە کلیلە بۆی ئەوەیە: کامیان**

---

(١) سورەتی هود(٦١).

(٢) سورەتی الملك(١٥).

(٣) سورەتی الجاثیة(١٣).

حوکمی ئەوی تریان دەکات ؟ گۆڕاو حوکمی نەگۆڕ دەکات؟ یاخود نەگۆڕاو حوکمی گۆڕاو دەکات؟! ناوەڕۆك حوکمی شێواز و روخسار دەکات یان رووکەش و شێواز حوکمی ناوەڕۆك دەکات؟

ئەگەر بڵێین گۆڕاوەکان حوکمی نەگۆڕەکان دەکەن، وەك خاوەنی بیرۆکەی پەرەسەندن دەڵێت: ئەوا ئەو چەقەمان لە دەست دەردەچێت، کەوا روخسارو شێواز لە دەوری دەخولێتەوە.. ئەگەر شێواز، پێوەرەکانی کە جوڵەی رێك دەخەن لە دەست بدات، وای لێ دێت لە کۆتاییدا ماناکەی لەدەست بدات ! بەڵام ئەگەر وتمان نەگۆڕەکان(الثابت) حوکمی گۆڕاوەکان دەکەن، هیچ لە دەست نادەین، نە نەگۆڕەکان ونە نەگۆڕاوەکان ! بەڵکو تەنها جووڵەی گۆڕاو رێك دەخات و لە خولگە ڕاستەکەی خۆی دەرناچێت.

ئەمەش ئەو ڕاستیە کە ئاسمانەکان و زەوی و مرۆڤی بۆ دورست کراوە:

﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾(١).

شەریعەت بەم شێوەیە هاتۆتە خوارەوە، بۆئەوەی، تا کۆتا زەمان و رۆژگار حوکمی مرۆڤایەتی بکات!

★ ★ ★

لێرەدا بوارمان نی یە سەبارەت بە لایەنە باشەکانی شەریعەتی ئیسلامی لە گشتگیریەکەیدا بدوێین یان چۆن بە شێوەیەکی هاوسەنگ و تەواو و تێروپڕ گونجاندنی بۆ ژیان ئەمە بوارێکی تر هەیە بۆی، بەڵکو لێرەدا خاڵێك دەدەینە بەر رۆشنایی و لەسەری دەدوێن ئەویش مەسەلەی(پەرەسەندن — التطور) لە شێوازەکانی ژیان و(نەگۆڕەکان)ی شەریعەت، لەگەڵ ئەو کێشەیەی: ئایا چۆن

---

(١) سورەتی الجاثیة(٢٢).

دەکرێ شەریعەتێك پێش چوارده سەده هاتبێتە خوارەوە دەتوانێت بەو هەموو گۆڕانکاریەی بەسەر ژیانی خەڵکدا هاتووە بڕوات و جێ بەجێ بکرێت. بەڵام پێش ئەوەی سەبارەت بەم مەسەلەیە گفتوگۆ بکەین دەمانەوێ لایەنێکی بیروباوەڕ روون بکەینەوە کە زۆر کەس لێی بێ ئاگایەو شایستە بە رۆشنایی خستنە سەرە.

لە ڕاستیدا ئەوانەی ئەو پرسیارە دەکەن -بزانن یاخود لە بێ ئاگاییانەوە بێت- بەلای کەمەوە یەکێك لە سیفەتەکانی خودا ئەگەر لە واقیعدا زۆرتر نەبێت ڕەت دەکەنەوە ئەویش سفەتی زانینە. وەك ئەوەیە وای بۆ دەچن خودا کاتێك ئەم شەریعەتەی ناردۆتە خوارەوە نەیزانیوە کە چەند شتێك دێتە پێشەوە لە بارودۆخی ژیانی خەڵك کاتی هاتنە خوارەوەی ئەم شەریعەتە نەبووە! لە هەمان کاتدا سیفەتی دانایی لە خودا دادەماڵن، چونکە وای بۆ دەچن ئەم شەریعەتە لە سنووری رۆژگارێکی دیاریکراودا توانراوە جێ بەجێ بکرێت و دواتر ناتوانرێ، بەڵام خودا هەتا رۆژی قیامەت سەپاندویەتی بەسەر خەڵکدا!! لە کاتێکدا خودا(علیم و حکیم)ە هەر چۆن لە وەسفی خۆی دەفەموێت بەڵام زۆرینەی خەڵك پێی نازانن.

ئێستا دەگەڕێنەوە سەر ئەو ئامێرەی خودا دایناوە تاوەکو ئەم شەریعەتە گونجاو بێت بۆجێ بەجێ کردنی تا رۆژی قیامەت و وای لێ کردووە جێگەی هەموو شتە نوێ یەکانی دێنە کایەوە لە ژیانی مرۆڤ و لەسەر ئەم سەر زەوی یە جێگەی بێتەوە تێیدا.

هەر لە دەستپێك و سەرەتاوە دەڵێین کە هەندێ شت هەیە لە ژیانی مرۆڤ دا دەبێت هەر بە نەگۆڕی بمێنێتەوە. ئەم شەریعەتە نەگۆڕی کردووەو رێگەی لە هەر دەستکاری کردنێك گرتووە تێیدا بکرێت، چونکە دەستکاری کردن لاسەنگی لە ژیانی مرۆڤایەتی دا دروست دەکات و، پێشتر باسمان کرد لە زانینی خودا کە(علیم و حکیم)ە و نەگۆڕ کردنی ئەوانە فەرمانێکی پێویستە و، خودا

فەرمانی کردووە نەگۆڕدرێن.

هۆکاری نەگۆڕی ئەو شتانەو ئەوانەی پەیوەستن و تایبەتن پێی ئەوەیە ئەمانە بەستراونەتەوە بە ڕاستیە نەگۆڕەکان و گۆڕان وەرناگرێت و، ئەگەر گۆڕدرا شتەکان تێك دەچن و خراپ دەبن.

یەکەم شت لەمانە پەرستنی خودایە بە تاك و تەنها و بەبێ هاوەڵ بۆ دانان.

لە کاتێکدا پەرەسەندووەکان(التطوريون) ئەم مەسەلە لەسەر هێڵی گۆڕاو دادەنێن و، وەك دەڵێن پێشتر ئاماژەیان پێدا مرۆڤایەتی بەسێ قۆناغدا تێپەڕیووە: جادوو و ئایین و زانست هەرچۆن جادوو شوێنی چۆڵ کرد بۆ ئایین بە هەمان شێوە ئایین دەبێت شوێن چۆڵ بکات بەڵکو پێویستە بۆ زانست! لە کاتێکدا ئەمان دەڵێن خودا لە بۆ پەیڕەوکردنی هەمیشەیی خەڵك دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾(١).

﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗا ﴾(٢).

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾(٣).

﴿ إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡ ﴾(٤).

بەڵگە نەویستە ئەم مەسەلە جێگیرو نەگۆڕە چونکە مەسەلەی خودایەتی و

---

(١) سورەتی البقره(٢١).

(٢) سورەتی النساء(٣٦).

(٣) سورەتی النساء(١١٦).

(٤) سورەتی الزمر(٧).

مافەکانیەتی بەسەر بەندەکانیەوەو خودای پاك و بێگەرد هەمیشە ناگۆڕدرێت، ئەوەی بەندەکانی خودا لە دروست کراوی خودا ڕاستیەکی هەمیشەیی و بەردەوامە و ناگۆڕدرێت، لەبەر ئەمە وای لێ دێت کە پەرستش لەسەر بەندەکان بۆ پەروەردگارو بەدیهێنەریان پێویست دەکات:

﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾[١].

﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾[٢].

خاوەنی بیرۆکەی پەرەسەندن بۆ لەق کردنی ڕاستیە جێگیرەکە وای دەخواست بۆیان لەسەر هێڵی گۆڕاوی دابنێین و، بۆ ئەم مەبەستە پێویست بوو درۆیەکی گەورەو شاخدار(زانستیانە) بکەن بەبێ ئەوەی تاکە یەك بەلگەیەشیان هەبێت، درۆی(دروست بوونی خود) بەبێ خوا و بەرێکەوت! درۆیەکی تریش کە لەو زیاتر لە ئەفسانەیی دا کەمتر نیە، درۆی سروشت بەدیهێنەرەو(خۆی بەدیهێنەرەو ڕێگرو سنور نیە بۆ تواناکانی لەسەر دروست کراوەکان)[٣].

مەسەلەی جێگیرو نەگۆڕاوی دووەم هەر لە مەسەلەی یەکەمەوە سەرچاوەی گرتووەو بە دوایدا دێت ئەویش پێویستە حوکم بەوە بکرێت خودا ناردویەتی:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾[٤][٥].

---

(١) سورەتی الاعراف(٥٤).

(٢) سورەتی الاسراء(٢٣).

(٣) بڕوانە ووتەکەی پێشوو داروِن کە پێشتر باسمان کرد.

(٤) سورەتی المائدە(٤٤).

(٥) لە دەروازەی یەکەم دا باسمان کرد کە مەسەلەی پێکەوە بەستنی شەریعەت بە بیروباوەڕەوە کرد.

بەڵگەی بیرۆکەی پەرەسەندن -یان یەکێك لە بیانووەکانیان- بۆ وەلانانی شەریعەتی پەروەردگارو دانانی حوکمی دەستکردی مرۆیی گوایە مرۆڤ لەوە گەورەتر بووە بەو کۆت و بەندە رازی بێت و ئیتر پێویستی بە ئامۆژگاری و رێنمۆیی خودا نیە!

مرۆڤ خۆی پێ ناگیرێت لە ئاست ئەو مرۆڤەی، کە لەم کۆت و بەند کردنە گەورەتر بووە چیتر پێویستی بە رێنۆینی خودا نی یە لە کاتێکدا نقوومی گومرایی و سەر لێشێوانی یەك لە دوای یەك هاتووەو هەر لەوێوە بیگرێت کە هەندێکیان لە گومرایی و سەرلێشێوایەکی تاکرەوی سەرکەشی دایە بەرەو پارچە پارچە کردنی کۆمەڵگا دەروات و هەندێکی تریان لەنێو لارییەکی تاریك دان بە کۆمەڵ بوون و خودی تاك تێدا دەمارێت! هەندێکی دی لە نێو خاوەنداریەتی تاکرەوانەی(ئازاد!) دایە هیچ رێك خەرێك نایگرێتەوە ئەمانە وا دەکەن چەند هەزار کەسێك ملیۆنەها دەکەن بەژێردەستەو بەندەی خۆیان و لەولاوە چەند تاکە کەسێك لەوپەری رابواردنێکی زیادەڕەودان و وادەکات کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵك بکەن بە بەندەی دەوڵەت وای لێ دێت چەند کەسێك حوکمی ژیانی ملیۆنەها بکەن و دەست بگرن بەسەر ژیانیاندا!

بەڕاستی گاڵتە ئامێزە.... پێگەیشتنی مرۆڤ و گەورەتر بوونی لەوەی خودا پابەستی ئامۆژگاری بکات و دەبێت واز لە رێنمویەکانی خودا بێنێ!

﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ﴾[1].

ئەگەر شەریعەت هەر لە سەرەتاوە پێویست بێت[1] پابەند بیت پێوەی، ئەوا

---

(١) سورەتی العلق(٦ — ٧).

لەنێو ئەم شەریعەتەدا چەند حوکمێکی جێگیرو نەگۆڕی تێدایە کە گۆڕانکاری تێدا ناکرێت، هەروەها چەند حوکمێکی گشتی جێگیری هەر لە خودی خۆیدا هەیە بەڵام دەتوانرێ چەند حوکمێکی گۆڕاو بچێتە ژێریەوە.

لەنێو ئەو نەگۆڕانەی(ثوابت) ، گۆڕان قبوڵ ناکات و ناتوانرێت گۆڕاوەکانیش لە ژێریدا جێگە بگرێتەوە هەموو حوکمەکانی پەرستش و سزاکان پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو ڕەگەز(لە نێوانیان دا پەیوەندیە خێزانیەکان: هاوسەرگیری و جیابوونەوەو میرات....... هتد).

چۆنیەتی و حوکمی پەرستنەکان لە لایەن خودای باڵا دەست و بێگەردەوە دەست نیشان کراوە کە چۆن مرۆڤ خودا بپەرستێت و پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) خەڵکی فێرکردووە چی لەسەریان واجبە و چی بۆیان ڕێگە پێدراوەو، لە کاتی خودا پەرستیدا چۆن جێبەجێی بکەن و، پاشان دەفەرموێت(من أحدث من امرنا هذا ما لیس فیه فهو رد) [٢]. (هەر کەسێك شتێك لەم ئایینە زیاد بکات کە لە خۆیدا نەبێت ئەوا فڕێ دەدرێت و دەدرێتەوە بە سەریدا).

پەرستنەکان لەلای خوداوە دیاری کراوەو پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ڕوونی کردۆتەوەو ئیتر کەسی تر ناتوانێت هیچی لێ زیاد بکات یان لێی کەم بکاتەوە بەپێی ئارەزووی خۆی.

دەربارەی سزاکان لە دەروازەی داهاتوودا سەبارەت بە پەیوەندی بە(شارستانیەت)ەوەو پەیوەندی شارستانیەت بە سزاکانەوە دەدوێین، چونکە ئەمە سەرچاوەی گومانەکانە لای(ڕۆشنبیران)ی هەواداری ئەوروپا، بەڵام تەنها

---

(١) لە دەروازی دووەمدا باسمان لە مەسەلەی(پابەندبوون)ەوە کرد بە شێوەیەکی ڕوون و کەمێك درێژەمان پێدا.

(٢) رواه الشیخان.

باس لەوە دەکەین کە ئەوروپای پەرەسەندوو مەسەلەی تاوان و سزای لەسەر هێڵی گۆڕاو داناوە لەبەر چەند هۆکارێك لە یەك کاتدا.

لەنێو ئەو هۆکارانەدا ئەوەیە ئەوروپای مەسیحی ئەم سزایانەی هەرگیز وەك شەریعەتێکی ئاسمانی جێ بەجێ نەکردووە، ئەگەرچی وێنەی زۆر هاتووە لە تەورات دا و پابەندبوونیان – بەزارەکی – بەشەریعەتی تەوراتەوە تەنها خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە مەسیح ئەوانەی حەرام بوو بۆی حەلاڵ کردن:

﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾(١).

﴿وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾(٢)

بارودۆخی ژێردەستەیی و بێ دەستەڵاتی مەسیحیەکان لەژێر ستەم زۆری ئیمپراتۆریەتی رۆمانی وای لێ کردن لەسێ سەدەی یەکەمدا رێگر بێت لەوەی شەریعەتە ئاسمانیەکان جێ بەجێ بکەن، هەر بۆیە وەك(ڕەوشت و هەڵس و کەوت) پەیڕەو دەکراو لە خودا ترسەکان لە لایەن خۆیانەوە وەك خوداپەرستی جێ بەجێ یان دەکردو، دەوڵەت وەك یاسا و حوکم جێ بەجێ ی نەدەکرد. بەلام دواتر کە قسطنطین بوو بە مەسیحی -یاخود وای دەرخست لەبەر چەند هۆکارێکی سیاسی- کردیە ئایینی فەرمی بەسەر ئیمپراتۆریەتی

(١) سورەتی ال عمران(٥٠).
(٢) سورەتی المائدة(٤٦-٤٧).

ڕۆمانەوە ساڵی ٣٢٥ زایینی پاپاکان لەوپەڕی دەستەڵاتیشدا بوون بەڵام هەوڵیان نەدا شەریعەتی ئاسمانی لەسەر پادشاو بطریکەکان بچەسپێنن و فەرزی بکەن. بەڵکو ئەوان هەوڵیان دا پاپاکان بخەنە ژێر ڕکێفی تایبەتی خۆیانەوەو قانون و یاسای ڕۆمانی هەر جێ بەجێ دەکراو بەپێی ئەم بنەما نامۆیەی دەربارەی ئایین دەکرا -هەموو ئاینێك- کە ئەویش:(ئەوەی هی قەیسەرە بیدە بە قەیسەرو ئەوەی هی خودایە بۆ خودا)! لێردا خودایەتی بوو بە دوو بەشەوە بەشێك بۆ خودا خۆی لە شێوازی پەرستن و لە خودا ترسی دڵەکان دا دەبینێتەوەو بەشەکەی تری بۆ قەیسەرەو حوکمی ئەو واقیعە دەکات کە خەڵکی تێدا دەژی!

﴿وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ﴾(١).

لەبەر ئەم هۆکارە ئەوروپا تەنانەت لە ڕۆژانی ئاینداری و پابەندبوونی پێی وەك هەڵس و کەوت و ڕەوشت و ئاکار دەیڕوانیە شەریعەت، نەك وەك چەند حوکمێك کە جێ بەجێ کردنی پێویست(واجب) بێت. بەڵام کاتێك ڕاپەرینەکەی دژ بە ئایین یان جیابوونەوەی لە ئایین دەستی پێ کرد شەریعەت لە لایان زیاتر ڕێزی کەمی کرد... هەتا کاتێك هەراو دەنگۆی پەرەسەندن هاتە ئاراوە بە تەواوەتی ڕێزی شەریعەتی لەلا داماڵین و جورئەتی پێ دان کە ڕەخنەی لێ بگرن و قسەی پێ بڵێن بەو بۆچوونەی، کەوا کلتورێکی(کۆنەپەرستانە)یە و دەبێت پەرەسەندن لایبدات و شتێکی(نوێ) لە شوێنی دابنێ، تەنها لەبەر نوێی لەبەر چاو دەگیرێ ئیتر لە خودی خۆیدا شایستەیە یان نا وەك یەکە! لەو شتە(نوێ)یانەی ئەوروپا گیرۆدەی بوو(زانستی

---

(١) سورەتی النحل(٥١).

شیکردنەوەی دەروونی)[١] بوو، یان لە راستیدا(زانستی بیانوو هێنانەوە بۆ تاوانکاری) کە وا بڕوانرێتە تاوانکار کە تاوانی بەرانبەر کراوەو ناکرێ سزای لەسەر جێ بەجێ بکرێت.

لێرەدا چەمك و تێگەیشتنی ئەوروپا سەبارەت بە تاوان و سزا ناخەینە بەر باس[٢]، چونکە وەك پێشتر وتمان لەم بەشەدا جەخت لەسەر یەك خاڵ دەکەین، ئەویش مەسەلەی پەرەسەندنە(التطور)، تەنها ئەوەندە دەڵێین ئەوروپا بە دانانی سزاو تاوانکاری لەسەر هێڵی گۆڕاو و ڕێگەدانی بە خۆی هەر دەبێت حوکمە ئاسمانیەکان لەم بارەیەوە لابدات و ڕێساو یاسای دەستکردی مرۆڤ لە شوێنی دابنێ[٣] - وەك هەموو خەڵك ئاگادارە- تووشی لافاوی تاوان و کارەسات بوو، بەردەوام لە زیاد بووندایەو ئەگەرچی بەهەموو وورياییی و ئاگادار یەکی خۆیان پێشی پێ دەگرن و سەرباری ئەو هەموو توێژینەوەو لێکۆڵینەوانەی لە:بوارەکانی پەروەردەیی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و یاسایی و ڕاگەیاندن و.... هتد دەیکەن، کە ئەو دەوڵەتانە لە نێوان ماوەی نزیك و بەبێ پچڕان ئەنجامی دەدەن!

ئەوەی دەبینرێ لە واقیعدا ئیتر پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات! ئەوەی دەبینرێ لە واقیعدا زۆر لە گووتن پاراوترە -لەنێو ڕاپۆرتەکانی خۆیان دا باسی

---

(١) دامەزرێنەرەکەی(فرۆید)ەو جولەکەیە، ترسناکترین شت لەو شیکرنەوە دەروونیەی لەسەر ڕێگای فرۆید دێتەکایەوە ئەوەیە لێپرسراویەتی لەسەر مرۆڤ لادەبات لەسەرکردەوەکانی بەو بیانوومیەی کە کاردانەوەی کرداری توندوتیژیە لەبارودۆخی نەخۆشی و گرێی دەروونی دا دروست دەبێت ئەم بنەمایەش ڕوخێنەر رەوشت و کردەوەی باشە وەك دەبینین.

(٢) ئەم مەسەلەیە بە دوورودرێژی لە دەروازەی داهاتوودا دەخەینەروو.

(٣) وەك پێشتر باسمان لێوەکرد لە ئەوروپادا شەریعەت بە واقعی جێ بەجێ نەکراوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێزو حورمەتی هەبوو لە لای خەڵك.

لێوە دەکەن- کە لەم ساڵانەدا چی روودەدات و هەموو گۆڤارەکانی جیهان لە کاتی خۆیدا باسیان لێوە کردووە کەوا کارەبای نیویۆرك جارێکیان بیست و پێنج سەعات لەسەر یەك بڕا واتە شەو رۆژێك و کاتژمێرێك تێیدا، لەو تاکە شەوەدا ئەوندە تاوان بە هۆی تاریکیەوە رووی دا بەرانبەر تاوانی یەك ساڵ بوو!.

پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو رەگەز شەریعەت حوکمەکانی جێگیر کردووە چونکە(ثوابت)ەو ناگۆردرێت، پیاو لە لایەك و ئافرەت لەلایەکی ترەوەو پەیوەندیەکانی بۆیەکیان ڕادەکێشێت لەلای سێ یەم چی لەم نەگۆڕانە(ثوابت) دەتوانرێت بگۆڕدرێت؟! لەبەر ئەوەی پیاو پیاوەو ئافرەت ئافرەتەو پەیوەندی نێوانیان پەیوەندیەکی ڕاکێشانی یەکترییە، هەر دەبێت چاو پێکەوتن رووبدات و ئەم چاوپێکەوتنە لە دوو شێوەدا خۆی دەبینێتەوە: شێوەیەکی رێکخراو وا دەکات ئەم بە یەك گەیشتنە بە ئامانج یان چەند ئامانجێکی دیاری کراو و رێکخەری دیاری هەبێت و شوێنەوار(مرۆیی) لەسەر دێتە دی، بەڵام جۆرەکەی دیکە بە نارێکی و بەبێ ئامانج و بەبێ شوێنەوار.

پەیوەندی نێوان هەردوو رەگەز لە ئەوروپا بە چەند رێکخەرێکی جێگیر(ثابت)ی ئاینی ڕێکخرابوو ئەو کاتەی ئەوروپا دەستیان بە داب و نەریتی ئاینەکەیانەوە گرتبوو[1] بەڵام لە دوای دەرچوون و یاخی بوونی لە ئایینەکەی وای بینی کە لە هێڵی جێگیرەوە ئەم پەیوەندیانە بگوێزێتەوە بۆ هێڵی گۆڕاو... ئەنجامی ئەم کارەیان چی بوو.

---

(١) ئەوروپا لە واقیعێکی بە وویقارو خنکاودا بوو سەبارەت بەم پەیوەندیانە بە هۆی کاریگەربوونی ئەو خەڵوەت کێشانە(رهبانیە)ەی مەسیحیەکان خۆیان دایانهێنابوو ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ﴾ سورەتی الحدید(٢٧).

ئەنجامەکەی ئەوەیە ئەمڕۆ لە رۆژئاوادا دەبینین -یاخود لەو وولاتانەیشدا کە رۆژئاوا دەستی گرتووە بە سەریاندا- لە بەڕەڵایی سێکسی و حەڵاڵ کردنی حەرام لە لایەن دروست کراوەکانەوە، لەگەڵ ئەو هەموو بەڕەڵاییەدا تاوانە سێکسیەکان بڵاون -یان بە واتایەکی دی بە هۆی ئەو هەموو بەڕەڵاییەی هەیە- ئەوەی لە واقیعدا دەبینرێت پێویستی بە روونکردنەوە نی یە!

مرۆڤ لەو کاتەی خودا بەدیهێناوە(مرۆڤە)! ئاژەڵێکی پەرەسەندوو نیە وەك داریونیزمی کۆن بەبێ بەڵگەی زانستی بانگەشەی بۆ دەکەن[1] مرۆڤ لە ژیاندا چەند ئامانجێکی هەیە ئاژەڵیانە نیە هەروەها ئاکاری ئاژەڵ نیە﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾[2].

پەیوەندیە سێکسیەکان وەك هەموو شتێکی تر لە ژیانی مرۆڤ دا ئامانجێکی(مرۆیی) و رێکخەری(مرۆیی) خۆی هەیە.

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾[3].

ئەو چێژەی جەستە لە تایبەتمەندیەکانی ئاژەڵە، بەڵام جێگیری و دانانی ماڵ و دڵ ئارامی و خۆشەویستی و میهرو سۆزەکەی لە تایبەتمەندی مرۆڤە. خودا لە زانین و دانایی خۆیەوە پێویستی کردووە کە ئەم چێژو حەزە جەستەیی ئاژەڵانەیە بگۆڕێت، بە نیشتەجێ بوون و ئارامی و خۆشەویستی و

---

(١) پێشتر ئاماژەمان پێدا کە دارونیومی نوێ ئەگەر چی لەگەڵ بیروباوەری پەرەسەندن(التطور) دایە بەڵام دانی ناوە بەوەی کە مرۆڤ جیاوازە لەوانی تر.

(٢) سورەتی ص(٧١-٧٢).

(٣) سورەتی الروم(٢١).

سۆزو میهرەبانی و ڕێکخەری مرۆڤانەی هەبێت، هەروەها پاشکۆی تر بەدوای خۆیدا دەهێنێ لەبەر ئەو هۆیە سنووری بۆ داناو دەفەرموێت: ﴿ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ﴾ لە نێو ئەو سنورانەی دیاری کردووە بە زانایی و دانایی خۆی ئارامی جەستەیی وئارامی دەروونی بەدیی دێت و، ئەو ئامێزە ئارامەی نەوەیەکی نوێ دێنێتە بوون و تاوەکو زەوی ئاوەدان بکاتەوە خۆشەویستی و ئارامی بۆ کۆمەڵگا دێتە دی بە هۆی کەمبوونەوەو ڕێگەگرتن لە تاوانکاری و پاراستن و دڵنیابوونی خەڵك لە بۆ ناموس و روحیان هەر چۆن خاوێنیەکی شایستە بە مرۆڤ بەرهەم دەهێنێت.

شەریعەتی ئاسمانی ئەم سنوورانەی چەسپاندووە، چونکە تاکە ڕێگایە بۆ بەدی هێنانی ئەم ئامانجەو، ئەگەر بەزێندراو لێی لادا -بەدرێژایی مێژوو- پشێوی و بەرەڵایی بەرپا دەبێت، وەك ئەمرۆ دەبینین هەروەها لارسەنگی و کەلێن دروست دەکات.

شەریعەت ڕێگەی ئەم بەیەك گەیشتنەی لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا چەسپاندوە، بە هاوسەگیری و بەبێ زیناو زۆر لێ کردن و هەتك کردن[1].

﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ

(١) المسافحە(زینا کردن و بەرەڵایی یە و هەروەها بێ هودەو هەتك کردنیش جۆرێکی ترە لەو شێوەیە نەفامی هاوچەرخ ناوی دەنێت(هاورێیەتی boy وgirl frined .(friend

﴿حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾[1].

دەڵێن: شەریعەت هەر چۆن رێگە بەیەك گەیشتنی هەردوو رەگەزی جێگیر کردووە، بەو شێوەیە ئەو شتانەی بەدوای ئەم بەیەك گەیشتنەدا دێن سنوری بۆ داناوەو چی لە ناویدا روو دەدا حوکمی نەگۆڕی بۆ دارشتووەو دەستکاری ناکرێت، چونکە جەخت لەو نەگۆڕانە دەکاتەوە دەستکاری ناکرێت و ناگۆڕدرێت. لەوانەی نەفامی هاوچەرخ ململانێ و گفتوگۆی لەسەر دەکەن - مەسەلەی ئافرەت و یەکسان بوونی لەگەڵ پیاو لە هەموو شتێکدا دەخەنەروو- مەسەلەی دەستەباڵای پیاو﴿ قَوَّٰمُونَ ﴾ و مەسەلەی میراتە، نەفامی هاوچەرخ بانگەشە بۆ ئەوە دەکات ئەو دوو مەسەلەیە بخاتە سەر هێڵی گۆڕاو بە بیانووی ئەوەی ژیان لە هەموو شتێکدا بەرەو پێش چووە!

بەڵام مەسەلەی دەست باڵای پیاو(قوامه)، ئەوا ئافرەتیان وەك پیاو لێ کرد و، لە نەفامی هاوچەرخدا پێیانگەیاندووە بۆ مەبەستێکی تایبەت و، فێربوو کاری کردوو، چەند پیشەیەکی گرتە ئەستۆ، بەڵام نەیتوانی سروشتە بەسۆزو میهرەبانەکەی خودا بەدیهێناوە لەسەری بیگۆڕێت، تاوەکو داواکانی ساواو رۆڵەکانی لێی تێر ببن، خودا بە دانایی و زانایی خۆی شارەزایە،کە بۆچی هەردوو ڕەگەز هاوشێوەنین، پاشان لە رووی جەستەیی و چالاکییبونەوە جیای کردونەتەوە! پاشان بە دانایی خۆی بۆ هەر ڕەگەزێك پیشەیەکی داناوە تایبەت بە تایبەتمەندیە چالاکی و بوون و دەرونیەکانیان خۆی و لەگەڵیدا دەگونجێ، هەروەها لە نێو ملیۆنێك ئافرەت دا هیچ سەیر نیە ئافرەتێك جیاواز بێت و ناوببرێت بە(ئافرەتی ئاسنین) یاخود زیوین یان مسین! حوکمەکان بۆ گشتی

---

(١) سورەتی المائدة(٥).

یە نەك بۆ حاڵەتە ناوازەکان ناکرێت پێوانەی لەسەر بکرێت[١].

مەسەلەی باڵادەست بوون بەشێکە لە مەسەلەی پێکهاتەی جەستەیی و چالاکوانی و دەروونی، چونکە ئەمانە ناگۆڕێن تاوەکو فیترەت خراپ بێت، چونکە کاتێك فیترەت خراپ بوو تاوان و خراپەکاری باڵ دەکێشێت بەسەر زەوی دا.

مەسەلەی میرات سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دابەش کردنی کارەکان و دابەش کردنی مەسرەف و خەرجیەکان. پیاو داوای لێ کراوەو لەسەریەتی خەرجیەکان بکات بە زۆر نەك بە خۆشی خۆی، ئافرەت لەسەری نیە خەرجی مەسرەف بکات ، ئەگەر لە خۆیەوەو بەبێ زۆر لێ کردن خەرجی کرد نابێت بە فەرمانێك و پاشتر حوکمی بۆ دابندرێت، ئەو تیمەی خودا لەسەری پێویست کردووە خەرجی بکات دوو بەشی پێ داوە، بەڵام ئەو تیمەی خەرجی لەسەر نیە یەك بەشی پێ داوە، تاوەکو بۆ خۆی بەکاری بهێنێت پاشان خودا دەفەرموێت:

﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَۚ وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾[٢].

لە فەزڵ و گەورەیی خودا بەسەر بەندەکانەوە ئەوەیە خەڵك بەگوێرەی سامان و پیشەکانی ژیانی دونیایان چوونە بەهەشتیان بۆ ناڕەخسێت، بەڵکو

---

(١) بڕوانە(الكسيس كاريل) الانسان ذلك المجهول وەرگێڕانی، شفيق اسعد، بيروت، ط٣ تایبەت لاپەرە ١٠٨ کە دەڵێت( هەموو خانەیەکی جەستەی ئافرەت هەڵگری مۆرکی رەگەزەکەیەتی).

(٢) سورەتی النساء(٣٢).

بەو ڕادەی خوداپەرستی دەکەن و گوێڕایەڵی و مل کەچ دەبن بۆی بەدەستی دەهێنن.

ئەم شتانەی شەریعەت حوکمەکانی چەسپاندووە وای لێ کردووە ناتواندرێت دەستکاری بکرێت و گۆڕاو و دەستکاری لە ژێریدا جێگەی نابێتەوە، چونکە گۆڕینی دەبێتە هۆی خراپ کردن و ئاژاوە لەوەی هەندێ لە شوێنەوارەکانی لەم ڕۆژگارەی جیهانی هاوچەرخی ئەمڕۆ بەناوبانگ و بینراوە.

بەڵام هەندێك شتی تر هەیە زۆرن خودا دەزانێ لە گۆڕان دایەو خودا نایەوێ لە بارێکی دیاری کراودا چەق بەستووی بکات، هەر لەو کاتەی ئەم شەریعەتە پیرۆزە هاتۆتە خوارەوە لەم بارەدا داینـاوە.

لە زانینی خوداو و دانایی یەکەی لەبیرنەکراوە -وەك هەندێ ململانێ کارو مقۆمقۆکار بە ئاگاییەوە یان لە بێ ئاگاییەوە وای بۆ دەچن- جووڵەی مرۆڤ لەسەر زەوی و گەیشتنی بەردەوامی بە گەردوونی ماددی یەوەو هەوڵدانی بۆ خستنە گەڕی ووزەکانی و کۆشش کردن بۆ بەکارهێنانی خاوەکان و باشتر کردنی ئامێرەکان و ڕازاندنەوەو جوانکردنی هۆکارەکانی ژیان و خۆشگوزەرانی بەرەو ڕوودانی گۆڕانکاری بەردەوامی دەبات لە شێوازەکانی ژیانی: ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی.

خودا خۆی مرۆڤی بەدیهێناوەو ئەو ووزەو وویست و خواستانەی بۆ داناوەو ئامادەی کردووە تاوەکو زەوی ئاوەدان بکاتەوەو ڕۆڵی جێنشین لەسەر زەوی بگێڕێت:

﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا ﴾[١].

خودا ژیانێکی بەرهەم دارو پیرۆز و بڵندی بۆ مرۆڤ دەوێت:

﴿هُوَ ٱلَّذِی جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولࣰا فَٱمۡشُوا۟ فِی مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَیۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴾[٢].

﴿وَجَعَلَ فِیهَا رَوَ ٰسِیَ مِن فَوۡقِهَا وَبَـٰرَكَ فِیهَا وَقَدَّرَ فِیهَاۤ أَقۡوَ ٰتَهَا فِیۤ أَرۡبَعَةِ أَیَّامࣲ سَوَاۤءࣰ لِّلسَّاۤىِٕلِینَ ﴾[٣].

خودا لە عیلمو دانایی خۆیدا پێشتر زانیویەتی کۆتا پەیامی بۆ کۆتا پێغەمبەران دەنێرێت و، دوای ئەو پێغەمبەری دی نانێرێت و داوا لە مرۆڤ دەکات ئەو شەریعەتە جێ بەجێ بکەن لە دوای ئەوەی کاملی کرد[٤] هەتا کۆتا زەمان و رۆژگار بە حیکمەتی و کەماڵی خۆی ئەو شتانەی گۆڕاون چەند بنەمایەکی نەگۆڕی بۆ داناون تا فراوان بێت بۆ شێوازە گۆڕاوەکان و جوڵەو بەکارهێنانیان لە هەمان کاتدا رێك بخات.

شێوازی سیاسی دەگۆڕێت بە گۆڕانی قەبارەی دەوڵەت و رێگاکانی بەرێوەبردنی، هەروەها بارودۆخی تاك دەگۆڕێت لەوەی تاکی هۆزێك بوو بوو بە تاکی میللەتێك، هەروەها بە ئەندازە سەربەخۆیی تاکەکەو بەسەربردنی ژیانی لەو روانگەیەوەو چەندەها گریمانەی ئالۆزو تێك ئالاوی تر وا دەکات

---

(١) سورەتی هود(٦١).

(٢) سورەتی الملك(١٥).

(٣) سورەتی فصلت(١٠).

(٤) خـودا دەفـەرموێت﴿ٱلۡیَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِینَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَیۡكُمۡ نِعۡمَتِی وَرَضِیتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَـٰمَ دِینࣰاۚ﴾ سورەت المائدة(٣).

شێوازو وێنەکانی حوکم و ڕێکخستنەکانی بەم هۆیانەوە دەگۆڕێت، بەڵام بنەما نەگۆڕەکانی(الثابتة)ی حوکمی(سیاسەتی شەرعی) دەکەن ناگۆڕدرێت: حوکم کردن بە شەریعەتی خودا و پەیمان بەستن(البیعە) و گوێرایەڵی جەماوەر بۆ فەرمانڕەواکەیان لە سنوری گوێڕایەڵی بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی و ئامۆژگاری جەماوەرەکەو بن دەستەکان بۆ قورئانی و فەرموودەکانی پێغەمبەر:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴾(١).

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێت: الدين النصيحة، قلنا لمن يا رسول الله؟ قال: لله ولكتابه و لرسوله ولائمة المسلمين عامتهم(٢).

ئایین ئامۆژگاری یە(پرۆگرامە)، ووتمان: بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی و فەرمانڕەوای موسڵمانان و هەموو خەڵك بە گشتی.

هەروەها دەفەرمووێت: إنه كان لكل نبي كان قبلي حواريون يهتدون بهديه ويأتمرون بأمره ثم إنه تخلف من بعدهم خلوف يقولون ما لا يفعلون ويفعلون ما لا يؤمرون فمن جاهدهم بيده فهو مؤمن ومن جاهدهم بلسانه فهو مؤمن ومن جاهدهم بقلبه فهو مؤمن وليس وراء ذلك من الايمان حبة خردل(٣).

---

(١) سورەتی النساء(٥٩).

(٢) اخرجه مسلم.

(٣)اخرجه مسلم

واتە: پێش من هەموو پێغەمبەرێك شوێن كەوتەو حەواری هەبووە، خەڵكی لێیانەوە فێربووەو فەرمانەكانی پێغەمبەرەكەیان گەیاندووە، پاش ئەوانە چەند جێگرەوەیەك لە جێگەی ئەوانە دانیشتوون، ئەوەی دەیڵێن خۆیان جێ بەجێ ی ناكەن و ئەوەی فەرمانیان پێ كراوە نایكەن، هەر كەس بە دەستی بەرەنگاریان بێتەوە ئیماندارە، هەر كەس بە زمان بەرەنگاریان بێتەوە ئیماندارەو، هەر كەس بە دڵی بەرەنگاریان بێتەوە هەر ئیماندارە، ئیتر لە دوای ئەوەوە یەك دەنكە خەردەل ئیمان نامێنێت.

(إنه يكون عليكم أمراء فتعرفون منهم وتنكرون، فمن أنكر فقد سلم ومن كره فقد برىء ولكن من رضى و تابع)[1].

هتد... هتد.....)[2].

واتە: چەند كەسێك دەبن بە فەرمانڕەواو كار بەدەست بە سەرەتاوە دەزانن لە ڕێ لادانیان دەبێت هەر كەسێك بەرپەرچی دایەوە سەلامەت دەبێت و هەر كەسێك زۆری لێ كرا ئەوا لێی بەریە، بەڵام هەر كەس كە رازی دەبێت پێی و شوێنیان دەكەوێت.

شێوازەكانی حوكمڕانی و... شێوازی ڕاوێژكردن و ... دابەش كردنی لێپرسراویەتیەكان لەنێو فەرمانڕەواو جێگرو یارمەتیدەرەكانی و ... ڕێگاكانی گرتنە دەستی حوكم و لابردنی ئەگەر پێویستی كرد هەموو دەكرێت بەپێی بارودۆخی هەموو میللەتێك و سەردەمێكدا بگۆردرێت.

شێوەو شێوازەكانی ئابوری لە گۆڕان دایە، بە گۆڕانی ئامێرەكانی بەرهەم هێنان و پێش كەوتنی زانست و تەكنەلۆژیاو ڕادەی بەكارهێنانی مرۆڤ بۆ ئەو

---

(١) اخرجه مسلم

(٢) بروانە كتێبەكانی سیاسەتی شەرعی وەك كتێبی(مارودی) و سەرچاوەی دی.

وزە ماددیانەی گەردوون کە خودا دەرگاکانی زانین لە بۆ مرۆڤ والا دەکات و چەندەها گریمانەو دیدی زۆرو تێك ئالا، بەلام بنەما جێگیرەکان کە حوکمی سیاسەتی پارەو سامان دەکات ناگۆڕدرێت و دەستکاری ناکرێت لە: سامان سامانی خودایە مرۆڤ سەرکارە لەسەری و فەرمانی پێ کراوە شەریعەتی خودای تێدا جێ بەجێ بکات و دەبێت سەرچاوەی پەیداکردنی خاوێن بێت نەك لە داگیرکاری و دزین و فێڵ و سوو و ئیحتکار و خواردنی کرێی کرێکارو ژێر دەستەکانیەوە قورغی بکات، هەروەها دەبێت لەبەکاربردنیشدا هەربەخاوێنی خەرجی بکات نەك لە رابواردن و زیادە ڕەوی و شتی خەیاڵی و حەرام دا لە ناوی ببات. پێویستە و هەر دەبێت زەکاتی لێ دەربکرێت، پاشان لە رێی خودا لێی خەرج بکرێت و بەپێی توانای مرۆڤەکەو زیاتر لە خۆی لێ داوا ناکرێت. بەلام شێوازی کردارە ئابوریەکان و شوێنی بەشداربوان تێدا جێگەی گۆڕانی بەردەوامە بە گوێرەی بارودۆخ.

شێوازەکانی کۆمەلایەتی لە گۆڕان دایە لەوانەیە کۆمەلگا هۆزایەتی بێت و یەکەی هۆز زاڵ بێت و سەرۆك هۆز نوێنەرو دەمڕاستی بێت و فەرمانڕەوایی بکات و تاك لەو روانگەیەوە بوونی خۆی ببینێتەوە، یاخود چەند هۆزێك لەنێو میللەتێك دا بوونیان توابێتەوەو تاك وەك خۆی و هەر بۆ خۆی بوونی خۆی بچەسپێنێت و ماڵ وخێزان هەستێت بە پەروەردەو رێنمایی یەکی سەربەخۆیانە، یان چەند دەزگایەکی دی وەك قوتابخانە و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بەشداری لەگەڵدا بکەن یان لەوانەیە دەزگاکان رۆڵی گەورەیان هەبێت و خێزان بەردەوام پەیوەستە سۆزی خۆشەویستەکانی پێکیانەوە دەبەستێتەوە هەر بمێنێت... ماڵ لەوانەیە خێزانێکی گەورە بێت و دایك و باوك و منداڵەکان و باپیرەو نەوەکانی پێکەوە تێدا بژی یاخود خێزان بچوك بێت تەنها دایك و باوك و منداڵەکان بێت... هتد ... هتد بەلام بنەما

**جێگیرەکان(الثابتة)ی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیان هەر بە نەگۆڕی دەمێننەوە:**

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾[1].

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَٰبِ ﴾[2].

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُوا۟ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ﴾[3].

﴿ وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ﴾[4].

﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ﴾

**کاتێ: شێوازەکان دەگۆڕێت لە رووی سیاسی و ئابوری یان کۆمەڵایەتی پێویستی بە حوکمی نوێ یە لە شەریعەتەوە سەرچاوە بگرێت و هۆکاری شەرعی بۆ ئەم کارە ئیجتهاد کردنە لەو شتانەی دەق لەبارمیانەوە نی یەو، ئەمەش گەورەترین لایەنی باشی ئەم شەریعەتەیە کە وای لێ کردووە بگونجێ بۆ ئەوەی هەرچی لە ژیانی خەڵك دا هەیە جێگەی بێتەوە تێداو بچێتە ژێر باڵیەوەو، دەیبەستێتەوە بە کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی(صلی الله**

---

(١) سورەتی الحجرات(١٠).

(٢) سورەتی الحجرات(١١).

(٣) سورەتی الحجرات(١٢).

(٤) سورەتی النساء(٣٦).

علیه وسلم) هەتا قیامەت هەڵدەستێت هیچ شتێك دژی نابێت.

ئیجتهاد کردنیش ڕێگەپێدراوە بەڵکو فەرمانی پێ کراوە:

﴿فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾[1].

پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) لە مەعازی(ڕەزای خوای لێ بێ) پرسی لە کاتێکدا کردیە والی یەمەن: چۆن دادوەری دەکەیت کاتێك هاتە پێشت؟ ووتی: بە قورئان، فەرمووی ئەگەر لە قورئان نەبوو؟ ووتی: بە سوننەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) نەبوو؟ ووتی: بە بۆچوونی خۆم ئیجتهادی بۆ دەکەم، پێغەمبەری خودا دەستی دا بەسەر سنگیدا وەك ڕازیبوون و هاوڕابوون لەبۆ ئەو قسەی کردی[2].

ئیجتهاد کردن چەند مەرجێکی دیاری هەیە لە زانستی(فقه) و(علم الاصول) و(علم الالة-زمان) و ڕوانین بۆ بارودۆخەکانی خەڵك و توانای بۆ هەڵهێنجاندن و کەسەکە ڕەوشت بەرزو ڕاستەڕێ و دەست پاك و ئەمین بێت لە بۆ ئایینەکەی.

ئیجتهاد لە سەرەتاو کۆتاییدا هۆکارێکی خودایی یە دانراوە تاوەکو خەڵك لەژێر چەتری شەریعەت دا بمێنێتەوە دەرنەچن و حوکمێکی نەفامی دەست کرد نەخرێتە شوێنی و تاوەکو بە جوڵەیەکی ڕێکخەرو ڕێك ببزوێنرێت و لە شوێنی خۆی دا چەقی بەستوو نەبێت بەڵکو ژیان دەبێت بەرەو پێش بجوڵێت و نابێت لە بەرەوپێش چوونەکەیدا لە شەریعەت و مەبەستەکانی لابدات و خراپەکاری لەسەر زەوی تەشەنە دەکات.

---

(١) سورەتی الحشر(٢).

(٢) رواه ابوداود.

بەرهەم و دەرئەنجامەکانی ئیجتهادی بەردەوام؛ چەند وێنەیەکی گۆڕاوە بەڵام بەدەوری چەقی نەگۆڕدا(ثابت)دا دەسوڕێتەوە، ئەمە سوننەتی خودایە بۆ هەموو دروستکراوەکان و لە بۆ ژیانی مرۆڤ، شەریعەتی ئاسمانی یەکانگیر دەبێتەوە لەسەر یەك شێوەی لەبارو گونجاو لەگەڵ گەردوون و ژیان و مرۆڤ.

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾[1].

---

(١) سورەتی ص(٢٩).

# دەروازی چوارەم

# گومانی دژ بەیەك بوونی شەریعەت لەگەڵ داواکاریەکانی شارستانیەتی نوێ و پێویست بوونی پێوانە کردن و وەرگرتنی ڕێساکانی شارستانیەت

لە دەروازەی سێ یەمدا ئاماژەمان بە هەندێ لە لایەنەکانی ئەم مەسەلەیە کرد: مەسەلەی دژ بەیەك بوونی شەریعەت لەگەڵ داواکاریەکانی شارستانیەتی نوێ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا لقێکە لە مەسەلەی پەرەسەندن(التطور) کە وای دەبینێ هەموو نوێ یەك پێویستە لە کۆنەکە چاکترین بێت تەنها لەبەر ئەوەی ئەمەیان نوێ یەو ئەویتر کۆنە، نەوەك لەبەر لایەنێکی باشی بابەتی لەمەیاندا هەبێ لەوی دی دا نەبێت! بەو دیدو بۆچوونە ئەم شارستانیەتەی هاتۆتە کایەوە ئەمرۆ(نوێ) باشترە لەوەی تێپەری ئەگەرچی لە ئاسمانەوەو لەلای خوداوە هاتبێتە خوارەوە!

ئەم دوو دڵی و گومانە بەهۆی چەند هۆکارێکەوە لە ئەوروپا تەشەنەی کرد، هەندێکی ڕەوا بوو زۆربەشی ناڕەوا بوو، بەڵام دوو دڵی و گومانەکە وای لە خەڵکەکە کرد لە تارمایی کەنیسەی بێزارکەر هەڵبێن و بەخێرایی﴿ كَأَنَّهُمۡ حُمُرٞ مُّسۡتَنفِرَةٞ ۝٥٠ فَرَّتۡ مِن قَسۡوَرَةِۭ ﴾[1]. ئەگەر لەم بارودۆخەی هەڵهاتن دا نەبوونایەو، بەو شێوەیە رایانەکردایە وەك کۆمەڵێك شێر یان تیر هاوێژ کەوتبێتە سەریان لەوانەبوو ژیرانەتر ئەم شتانەیان و، زۆر شتی تریش لێك بدایەتەوەو، بێ ئاگایانە هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا نەکردایە وەك ئێستا کردیان و پاشان بەهۆی دەستەڵاتی سەربازی و ئابووری و مرۆیی و زانستیان بەسەر کەسانی تر لەسەر زەوی ئەم دوو دڵی و گومانانەیان نەدەچاند و

(١) سورەتی المدثر(٥٠-٥١).

بڵاویان نەدەکردەوە.

لەڕاستیدا ئەو سەردەمەی کە ئاینی دەستکاری کراوی کەنیسە باڵادەست بوو سەردەمی تاریکستانی ئەوروپا بوو، وەك خۆیان سەبارەت بە سەدەکانی ناوەڕاستی کەنیسەو پیاوانی ئاینی کۆتایی پێهێنراو بەزێنراو بەسەردەمی ڕووناکی و کرانەوەو سەردەمی پێشکەوتنی هەموو بوارەکانی ژیان و سەردەمی هێزو دەسەڵاتە بە تایبەت بۆ ئەوروپا.

لەبەر ئەمە ئەوروپا پێی وابوو(ئایین) هۆکاری دواکەوتنەکەی بووەو، نهێنی سەرکەوتنی شارستانیەت و ژیار ئەوەیە لەسەر ئایین بنیات نەنرێ و، بێ ئاینی هەموو هۆکارەکانی هێزو پێشکەوتن و بڵندایەتی بۆ مرۆڤ بەدی دەهێنێت.

لەوانەیە بەهۆی ئەو ستەم و چەوساندنەوەی کەنیسەی زۆردار بەسەر خەڵکەوە دەیکرد بۆ هەموو بوارەکانی ژیان هەوڵ بدەن بەهانەی ئەوروپیەکان ڕەوابێت، چونکە چەوساندنەوەی ڕۆحی و سامان و لایەنی سیاسی و عەقڵی و زانستی گرتبویەوە، تەنانەت ئەو شتانەی بەس بەدڵیاندا بهاتایە لەسەریان دەکردنە ماڵ و دەیان چەوساندنەوە، ئەشکەنجەیان دەدان لەسەر دەستی دادگای پشکنەر، لەیەکەم ساتی گومان بونیان لە لایەنگری یان بۆ کەنیسە و بیروباوەڕەکەی، بەڵام دەبێت جارێکی دی لەبەهانە هێنانەوەکەیاندا ئەوەیان بۆ بهێنینەوە کە ئەم نمونەی ئیسلامە(کە گرەنتی هەبوو دەیتوانی ژیانی ئەوروپا چاك بکات ئەگەر ئیسلامی هەڵبژاردایە). کەنیسە شێوەی ئیسلامی لەلای ئەوروپیەکان بەدڕندەترین شێوە شێواندبوو، لە ترسی ئەوەی نەوەك بکەونە ژێر کاریگەری ئیسلامەوە، لەرۆژهەڵاتی ئەوروپاوە هەر چۆن لە کاریگەری(هێرشی فیکری) ئیسلامی تۆقیبوو، ئەو نێردراوە ئەوروپیانەی دەهاتنە وڵاتی ئیسلام و لە پەیمانگای زانستە ئیسلامیەکانەوە دەگەڕانەوە.

مێژوو نووسی ئینگلیزی ویلز لە کتێبەکەیدا(معالم تاريخ الانسانيه)دا دەڵێت: ئەگەر کەسێکی خاوەن تێروانینێکی زۆر تیژو زرنگانە تەماشای جیهانی بکردایە لەسەرەتاکانی سەدەی شانزەهەم ئەوا لەوانەبوو بیگەیاندایەتە ئەو دەرئەنجامەی کە چەند نەوەیەکی کەم تێدەپەڕێت و زۆری پێ ناچێت یان هەموو جیهان وەك مەغۆلی لێ دێت، یان دەبن بە ئیسلام[1].

هەر چۆنێك بێت ئەوروپا بەهەڵەداچوو لە هەردوو رووەکەوە لە یەك کاتدا یەکەمیان کە پێی وابوو ئەم ئایینە دەستکاری کراوەی کەنیسەی کردە نمونەی هەموو ئاینێك کە هەروایە، تاکە ڕێگا ئەوەیە یان دەبێت لەسەر ئەم ئایینە بمێنێتەوە، بەم ستەم و تاریکی و دواکەوتوویییەی یان دەبێت ژیانێکی بێ ئایین هەڵبژێرێت(ئەمەش دوای ئەوەی بزووتنەوەکانی(چاکسازی ئاینی) دەستەوسان بوون لە گۆڕانکاری ڕێك لە ناوەڕۆکی گرفتەکە). دووەمیان ئەو تێروانینە بوو -لەدوای وازهێنانی لە ئایین- کە پێی وابوو جێگیر بوون و دەست گرتن بەسەر زەوی دا تاکە خواستە کە مرۆڤ بۆی دورست بووەو، هەر لەو پێناوەدا دروست بووەو بە هەر هۆکارێك بەدی بهێنێت ئەوا سەرکەوتووەو براوەیە! ئەمەش بە هەموو دیدو بۆچوونەکانیەوە تێروانینێکی نەفامانەیە.

نەدەست گرتن بەسەر زەوی دا بەهەر هۆکارێك بێت خواستی بوونی مرۆڤایەتی یەو نەهێنانەدی بەتەنهای نیشانەی (سەرکەوتن)ە بە پێوانەی شایستەو شیاو بە مرۆڤ!

خودا لە دونیادا دەستەڵات و فەرمانڕەوایی بەبێ باوەڕو باوەڕدار دەدات ، ئەگەر مەرجەکانی جێگیربوونی تێدابوو:

---

(١) ویلز، معالم تاريخ الانسانية، وەرگێرانی توفيق جاويد، القاهره ط٣ ١٩٦٧ ز، ج٣ ل٩٦٦.

﴿ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴾[١].

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴾[٢].

بەڵکو خودا ئەگەر بیەوێت دەستەڵات دەدات بەبێ باوەڕ لە دنیادا تا ئەوپەری ڕۆچوونی خۆی لە بێ باوەڕی دا بنوێنێ و بۆی درێژ دەکاتەوە تا زیاتری دەکات و هەموو گوناهەکانی بە تەواوەتی لە قیامەت دا بدات بە کۆڵی خۆیدا!

﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ ﴾[٣].

﴿ لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾[٤].

پەندو ئامۆژگاری لە خودی دەستەڵاتەکەدا و، لە واڵابوونی هەموو دەروازەکانی ژیانی دنیا بۆ مرۆڤ بە تەنها نیە، بەڵکو مرۆڤ بەدیهێنراوە تاوەکو ڕۆڵی خەلیفەی چاکەکار لەسەر زەوی بگێڕێت و، بەپێی پرۆگرامی پەروەردگاری زەوی ئاوەدان بکاتەوە، ئەوە ئەو سەرکەوتنەیە کە دەستەڵاتی ڕازیبوون بەدوای خۆیدا دەیهێنێت و باشترین دەستکەوتیش بۆ دوا ڕۆژ بەدی دەهێنێت هەر چۆن بە پیتی و دڵ ئارامی بەسەردا دەڕژێ و هەموو ئەمانەش تەنها بە ئیمان و خودا پەرستی دێتە دی:

---

(١) سورەتی الاسراء(٢٠).

(٢) سوروتی هود(١٥).

(٣) سورەتی الانعام(٤٤).

(٤) سورەتی النحل(٢٥).

﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ﴾(١).

﴿ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ ﴾(٢).

﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ﴿٤﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾(٣).

**بەڵام دەستەڵات لەسەر زەوی بە تەنها و بەبێ پرۆگرامی پەروەردگار و ئاسمانی لەگەڵ ئەوەی ماوەکەی بەستراوەتەوە بە کاتێکی دیاریکراو و ساڵانێکی ژمێردراو لەبۆ دوا رۆژیش بێ بەرهەمەو هیچی لێ دروێنە ناکرێت و هەگبەی خاڵیە:**

﴿ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا ۚ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾(٤).

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ

---

(١) سورەتی الاعراف(٩٦).

(٢) سورەتی الرعد(٢٨).

(٣) سورەتی المؤمنون(١-١١).

(٤) سورەتی الانعام(٤٤-٤٥).

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾[1].

هەروەها جگە لەمانە هیچ بەرەکەت و پیت و دڵ ئارامی لە ژیانیادا نی یە.. ئەوان(خۆش رادەبوێرن) بەڵام..

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ ﴾[2].

هەموو ئەم وشانە لەلای خەڵکی ئەوروپا نەبوو لە کاتێکدا سەر لێشێواوانە هەڵدەهاتن

﴿كَأَنَّهُمۡ حُمُرٞ مُّسۡتَنفِرَةٞ ۝٥٠ فَرَّتۡ مِن قَسۡوَرَةِۭ ﴾[3].

ئەمانە کۆمەڵە وشەیەکن مرۆڤی نەفام لێی تێ ناگات کە هاوشێوەکانی لە رابردوودا وتویانە:

﴿نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾[4].

﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ﴾[5].

**پاشان ئەوروپا کەوتە نێو گومانێکی نەفامانەی ترەوە...**

کاتێك لە کۆت و زنجیری کەنیسەی زۆردار ڕزگاری بوو دەستی کرد بە فێربوون و زانست وەرگرتن... زانست لە ململانێیەکی گەورەدا بوو لەگەڵ کەنیسەدا، کە زانایانی دەسوتاندو ئەشکەنجەی دەدان لەسەر ئەوەی دەیانووت

---

(١) سورەتی هود(١٥-١٦).

(٢) سورەتی محمد(١٢).

(٣) سورەتی المدثر(٥٠-٥١).

(٤) سورەتی سبأ(٣٥).

(٥) سورەتی العنكبوت(٤٣).

زەوی خڕە، بەم زانیاریانەیان پێچەوانەی(زانیاریەکانی) کەنیسە بوون یان بە واتایەکی دی ئەفسانەو خورافاتانەی لە نەزانینی خۆیانەوە دروستیان دەکردو بە ناوی ئایینەوە بڵاویان دەکردەوە[١].

بەهۆی ئەو ململانێیەوە و بەبێ بەڵگەیەکی بابەتیانە ڕێگەی زانست و ئایین جیاکرایەوە، لە لای ئەوروپیەکان زانست و ئایین بوون بەدوو بەرەی دژی یەك، هەر کەس زانستی بوێت دەبێت ئاین پشت گوێ بخات(یان دژایەتی بکات) و هەر کەس ئاینی بوێت زانست واز لێ دەهێنێت، لێرەدا دوو خواستی جمك(دوانە) لە یەك جیاکرانەوە: خواستی پەرستن و خودا پەرستی کە لە فیترەتی مرۆڤدا هەیە﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾[٢] وە خواستی زانین و فێربوون کە بەهەمان شێوە خودا لە فیترەتی مرۆڤدا چاندوویەتی تاوەکو ڕۆڵی جێنشین لەسەر زەوی ببینێت: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا﴾[٣] ﴿ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾[٤].

ئەم ململانێیە دڵنیایی و ئارامی دەروونی لەبار برد کە بۆ بەدیهێنەر بیکەن بە ووردبوونەوە لە ئایەتەکانی خودادا لە گەردوون و، هەروەها بۆ

---

(١) لە گرنگترین هۆکارەکانی وەستانی کەنیسە دژی زانست ئەوەبوو کە سەرچاوەکەی لە زانستی ئیسلامەوە بوو وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا هەرمشەی لە ئەوروپا دەکرد ببێت بە ئیسلام و ئەم هۆکارە سەرچاوە ئەوروپیەکانی باس لە ململانێ ی نێوان کەنیسەو زانست دەکەن دەیشارنەوەو باسی لێوە ناکەن چونکە نایانەوێ دان بنێن بە فەزڵی ئیسلام و موسڵمانان دا.

(٢) سورەتی الروم(٣٠).

(٣) سورەتی البقرة(٣١).

(٤) سورەتی العلق(٤-٥).

ئەوەی تایبەتمەندیەکانی بونەوەرەکان بزانێت بۆ ئەوەی پەروەردگار ئاسمانەکان و زەوی بخاتە خزمەتی مرۆڤەوە، ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴾[1]

زانست لە ئەوروپا پێش کەوت بەهۆی ئەوەی لە سەرەتاوە لە قوتابخانەکانی موسڵمانانەدا فێربوو بوون لە دیارترینیان پرۆگرامی تاقیکاری لە توێژینەوە زانستیەکان دا، هۆکاری دووەمی پێش کەوتنیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەوڵ و کۆشش و کۆڵنەدانەیان لە گۆڕەپانی تاقیکاری و توێژینەوەدا کردیان، لەگەڵ بەهەندگرتن و لێزانین و بلیمەتی لە ڕێکخستندا... بەڵام لە هەموو هەنگاوەکانیدا دژ بە ئایین بوو بەهۆی ئەو کەللەڕەقییەی کەنیسەی گەورە لەدژایەتی کردنی زانست و زانایاندا کردی.

زانست ئەو بەرهەمەی چاندی لەسەر گۆڕەپانی ئەوروپادا دروێنەی کرد و ئاوەدانی ماددی لەسەر زەوی پێش کەوتنێکی مەزنی بە خۆیەوە بینی و، بارودۆخی ماددی خەڵك بەرەو باشترین بار و بوژانەوە چوو، بەمشێوەیە ئەوروپا هێزێکی ماددی گەورەی بە دەست هێنا، توانی بەهۆیەوە بەسەر زەوی دا بڵاوە بکات و دەستەڵاتی بگرێتە دەست، ئەمەش کردیە خاوەن سامانێکی زۆرو خۆشگوزەرانی و پێش کەوتنی ماددی زۆری بەدەست هێنا، بێ گومان ئەم بارودۆخە(نوێ)یە زۆر باشتر بوو لەسەدەکانی(تاریکی) ئەوروپا.

پاش ئەوەی ئەوروپا رایکردو دابڕا لە ئاینەکەی ئەمانە هەمووی بۆ هاتەدی، جارێکی تر ئەو گومان و بیرۆکەیەی لەلا چەسپاوو پیرۆز بوو گوایە(ئایین) ڕێگرو لەمپەرە لە ڕێگەی ژیارو شارستانیەت، وا پێویست دەکات ژیارو شارستانیەت دژ بە ئایین بێت تاوەکو خەڵك بەرهەمی لێ بچننەوە پێی،

---

(١) سورەتی الجاثیة(١٣).

خۆشگوزەران بن ئەو پێوەرەی پێشکەوتنی مرۆڤ پێ سەنگ دەکرێت(شارستانیەتە) نەك(ئایین).

لێردا ئەوروپا کەوتە نێو گومانێکی دوو سەرەوە، لە کاتێکدا ئەو لە دەست دڕندەیی کەنیسە و بەبێ ئاگایانە و بەبێ رێکخەرێك ڕای دەکرد و لێی هەڵدەهات، لایەکی گومانەکە ئەو بۆچوونەی بوو بۆ(ئایین) کە ڕێگرو لەمپەرە لەبەردەم شارستانیەتدا لە کاتێکدا کۆسپەکە ئایینە دەستکاری کراوەکەی کەنیسەو هەڵس و کەوتی کەنیسە بەو ئایینە دەستکاری کراوەیە کە خۆی دایهێنا بوو لە لای خۆیەوە نەوەك لە لایەن خوداوە لە ئاسمانەوە بەم شێوە دەستکاری کراوە هاتبێتە خوارەوە.

لایەنێکی تر گومانەکە ئەو تێڕوانینەی ئەوروپا بوو کە گوایە ژیان بەبێ ئایین لە هەموو بارودۆخ و بوارەکانی ژیان دا چاکترە لەوەی بە ئاینداری یەوە بێت... پێمان وایە ژیانی ئەوروپا لەژێر سێبەری ئەو ئایینە خراپەدا هەر پێویست بوو کە یاخی بێت لە ئایینەکە تاوەکو بارودۆخی باشتر بێت و لەو تاریکییە بێ تروسکاییەی سەدە تاریکەکانی ناوەڕاستی گرتبوویەوە خۆی دەرباز بکات.

بەڵام هاوڕانین لەوەدا کە ژیان بەبێ ئایین باشترە بۆ ئەوروپا بۆ هەموو مرۆڤایەتی لەو ژیانەی بە ئاینداری راستەقینەی دەبێت هەموو مرۆڤایەتی دەبێت بیگرێتەبەر.

بەڵام زانست پێش کەوت و ژیانی ماددی لەهەموو بوارەکانیەوەی بەرەو پێش برد بەڵام بە تەماشایەکی پشکنەرانەو وورد بوونەوە بڕوانە(پوختە)ی هەموو ئەمانە.. هەروەها تەماشای(مرۆڤ) بکە ئایا هەمووی پێشکەوتووە، یاخود هەرەسێکی هێناوە لەوانەیە بە درێژایی هەموو مێژوو هەرەسی وای نەبینیبێت، مرۆڤ دەستەڵاتی گرتووە بەسەر(ژینگە)دا وەك جولیان هکسلی لە

کتێبەکەیدا(الانسان في العالم الحدیث) کە پێشتر ئاماژەمان پێدا لە دەروازەی سێ یەم دا، مرۆڤ خەریکە بە گومانی ئەو دەست دەگرێت بەسەر بۆشاییەکانی ئاسمان دا[١]. بەڵام نەیتوانیوە دەست بگرێت بەسەر ئارەزووەکانی دا، بەڵکو بواری بەهەموو شێوەیەك بۆ واڵاکردووەو هیچ جیاوازیەکی نیە ئارەزووی سێکس، یاخود رابواردن لە رێگەی حەرام یان حەڵاڵ یاخود ئارەزووی دەستەڵات و سەپاندن و زۆرداری کردن.

داگیرکەر بە هەموو تاوانکاری و درندایەتیەکەیەوە بەرهەمێکی سروشتی یە بۆ شارستانیەتێکی نەفامی بێ ئایین، ئەدی ئەمە لە رێ لادانێکی روون و ئاشکرا نەبوو ئەم شارستانیەتە دەیتوانی خۆی لێ بەدوور بگرێت تاوەکو ناوبانگی خۆی بپارێزێت وەك هەندێك بەباڵایاندا هەڵدەدەن و سەرسامن بە شارستانیەتەکەی ئەمە ئەنجامە ڕەسەنەکەیەتی چونکە هەر کاتێك مرۆڤ هێزی پەیدا کردوو باوەڕی بەخوداو پێغەمبەرەکەی و پەیامەکانی نەبوو ئەمە سەرئەنجامەکەیەتی بە درێژایی هەموو مێژوو.. سەرکەش و گومڕا دەبێت.

چونکە دەستەڵات ئەگەر بەترس و خودا پەرستی رێك نەخرێت و بەرپەرچی نەدەیتەوە گومڕا دەبێت، ئەوروپا لە کۆیلەکردنی گەلە لاوازەکان و مژینی خوێنیان لەسەر هەمان رێڕەوی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی رۆیشت و بەهەمان شێوەی ئەوان بەهانە بۆ خۆی دەهێنێتەوە، رێگە بەخۆی دەدات دڵەکانیان هاوشێوەن! هۆکارەکە هەمیشە یەکە.. دەستەڵاتێك بەبێ ئایینداری ئەگەر پێت خۆشە بەراوردێکی خێرا بکە لە نێو بزوتنەوەی فراوانخوازی ئیسلامی لەسەر زەوی لەگەڵ بزوتنەوەی فراوانخوازی ڕۆمانی کۆن و

---

(١) ئەوەی ئەم گومانەی ئەم هەڵدەوەشێنێتەوە کە دەستەڵاتی نی یە تۆقینی خەڵکە لە فراوان بوونی درانەکەی ئۆزۆن لە بەرگە هەوای زەوی دا و ئەو پاشکۆ روخێنەرانەی بۆ ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

فراوانخوازی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا هەتاوەکو جیاوازیەکەت بۆ روون بێتەوە.

فراوانخوازی ئیسلامی کۆیلەو ژێر دەستەکانی رزگار دەکرد و ئازادی دەکردن وەك رەبعی کوری عامر لە ووتە پاراو و داهێنەرانەکەیدا کە وەڵامی رۆستەمی سەرکردەی فارسی دایەوە، لە وەڵامی ئەو پرسیارەی: چی ئێوەی هێناوە بۆ وڵاتی ئێمە؟ وتی: خودا ئێمەی ڕەوانە کردووە تاوەکو ئەو بەندانەی دەیانەوێ لە بەندایەتی بەندەکان رزگاریان بێت بۆ بەندایەتی خودا، ڕزگاریان بکەین لە تەسکی دنیاوە بۆ فراوانی دنیاو دوا رۆژ.

لە کاتێکدا فراوانخوازی رۆمانی کۆن و فراوانخوازی رۆژئاوا لە ئەمڕۆدا ئازادەکان دەکەن بە کۆیلە،

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ ﴾[1]. ئەو بێ رەوشتیە و پاشکۆکانی لە بڵاوبوونەوەی مەی و ماددە هۆشبەرەکان و لادان و شازەکان و تاوان هەموو بەرهەمی ئەو شارستانیەتە نەفامیە دوور لە ئایینەیە.

لادانێك نیە هاتبێتە بەردەمی و بتوانێت خۆی لێ لابدات تاوەکو لە لەناوچوون خۆی بپارێزێت، وەك هەندێك لە هەوادارانیان و ئەوانەی دەترسن لەناو بچێت وای بۆ دەچن! بەڵکو ئەمە دەرئەنجامە رەسەنەکەی خۆیەتی، کاتێك هەلی رابواردن بۆ رابواردن هەڵبکەوێت بەبێ رێکخەری ئاینی کە ئەم خۆش گوزەرانیانە رێك بخات ئەنجامەکەی هەر یەکە: نقووم بوون لە ئارەزووەکاندا و، پاشان لە رێگەلادان.

جۆرەها شێوەی شێتانە باڵی بەسەر کۆمەڵگای رۆژئاواییدا کێشاوە: شێتی سێکس و، شێتی مۆدێلی جل و بەرگ و، شێتی رازاندنەوەو، شێتی خۆ رووت

---

(١) سورەتی النساء(٧٦).

کردنەوەو سینەماو تەلەفزیون و ڤیدیۆ و، شێتی تۆپی پێ و، جۆرەها شێوەی تر لە شێتی یە شەرمەزاری هێنەکان، هەمووی بەروبوومی ئەو شارستانیەتە بێ ئایینەیە.. ئەگەرچی پاش ماوەیەکی زۆر لە دوای دروست بوونی ئەم شارستانیەتە هاتە کایەوە، بەڵام ئەمە یەکێکە لە سوونەتەکانی سروشت، لە سوونەتەکانی خودا دا: پلە بە پلە لە هەموو شتێکدا، هیچ شتێك لە بارودۆخێکی لەناکاو لەسەر زەوی نایەت(تەنها سزاکانی لە پڕ، خودا بەوویستی خۆی وەك خێرایی بروسك دەیهێنێت بەسەریان دا) ئیتر هەموو شت هێواش هێواش لەسەر ئەو هێڵەی خەڵك بۆ خۆیانی هەڵدەبژێرن، لەسەرەتاوە ئەگەر بیانەوێت لەسەر ڕاستە ڕێگای خودا بمێننەوە، خودا ڕێگاکەیان بۆ ئاسان دەکات، ئەگەر بیانەوێت لابدەن ئەوەی دەیانەوێت بۆیان زیاتر دەکات.

کەس ناڵێت ئەم شارستانیەتە هەمووی ڕەشەو چاکی تێدا نیە! هەر چۆن تەماشای نەفامیەکان بکەین بە درێژایی مێژوو هەمووی ڕەشی بێ چاکە نەبوون!

بەڵێ! خاڵی سپی زۆری لەم لاو ئەولادا بڵاوکردووەو، پێش کەوتنی زانستی تێدایە، پێش کەوتنی تەکنەلۆجی زۆر بارگرانی لەسەر مرۆڤ هەڵگرتووەو داویەتی بەکۆڵی ئامێردا. هەروەها پێداگری لەسەرکارو ئارامی و لێزانینی تێدایە، توانا بێ ئەندازەکانی لە ڕێکخستن دا و هەروەها گیانی زانستیانەو کردارییانەی تێدایە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان، هەندێ لە خووڕەوشتەکانی تێدایەو سوودبەخشەو ڕاستە دەبێتە هۆی ئاسانکاری بۆ هەڵسن وکەوتی ڕۆژانەی خەڵك و ئاڵۆزی تێدا ناهێڵێت...

هەموو ئەم خاڵە سپییانەی ئەم نەفامیە سیفەتی نەفامی لەسەر لانابات، چونکە خودا بەڕاستی ناناسێت و بەو شێوەی خودا دەیەوێت پەرستشی بۆ

ئەنجام نادات[١]. پاشان خۆی ناپارێزێت لە لەناوچوون لەو کاتەی خودا بۆی دیاری کردووە، چونکە سوننەتێکی حەتمی هەیە لە سووننەتەکانی خۆی رووەدەکاتە ئەوانەی سوورن لەسەر لادان لەسەر رێگەکەی و هەتا خۆیان نەگۆڕن خودا بۆیان چاك ناکات:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ ۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ﴾[٢].

﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ﴾[٣].

﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[٤].

لە لایەکی ترەوە حەتمی نەبوو کە ئەم شارستانیەتە ئایین وەلا بنێت هەتا بگات بەهێزو پێش کەوتنی زانستی و تەکنەلۆجی، ئەمانە هەموو دەکرا و دەگونجا وەك چۆن موسڵمانان پێشتر توانیان ئەگەر ئەوروپا ئیسلامی قبوڵ بکردایە.

ئەمانە هەموو لە چەند دەرئەنجامێکی ئاشکراو روون دا کورت دەکەینەوە:

---

(١) ئەمە مانای قورئانە بۆ نەفامیەت وەك لە زۆر شوێنی جیاواز لە قورئان دا هاتووە: بە نەفامی بەرانبەر بەراستەقینەی پەروەردگارێتی و شوێن نەکەوتنی ئەوەی خودا رەوانەی کردووە.

(٢) سورەتی الرعد(١١).

(٣) سورەتی الحج(٤٨).

(٤) سورەتی الانعام(٤٤-٤٥).

یەکەم: بارودۆخێکی تایبەت لە ئەوروپادا وای کرد کە ئایین وەلا بنێت و بکەوێتە جەنگی نێوان ئایین و زانست و، ئایین و سیاسەت و، ئایین لەگەڵ ئابووری... هتد.

دووەم: ئەوروپا وای بۆ دەچوو ئایینەکەی خۆی ئیتر(ئایین)ە.. لەو سەرچاوەیەوە گومانی برد دەبێت ئایین فڕێ بدرێت و شارستانیەت بەبێ ئایین بنیات بنرێ.

سێ یەم:ئەوروپا کاتێك خۆی لە ئایینە شێوێندراوەکەی داماڵی و لە هەمان کاتدا خۆی لەو ڕێکخەرانەیش ڕزگارکرد کە مرۆڤایەتی مرۆڤ دەپارێزێت و، پاشتر شوێنی ئارەزووکانی کەوت و، پاشان لەسەر ئەم ئارەزووەی (شارستانیەت)ی بنیات نا کە خۆی پێی سەرسام بوو چونکە بە پێی ئارەزووەکانی داپڕشتبوو، پاشتر کردیە بنەما هەموو شتێکی پێ دەپێوا، پاشان تەماشای ئاینی کرد کە پێشتر بنەمایەك بوو پشتی پێ دەبەسترا بینی پێچەوانەی ئەمە هەر بۆیە فڕێ ی داو وەلانانی ئاینی کردە پێوەرێك بۆ هێنانە دی پێش کەوتن و شارستانیەت و بڵندی(١).

## پاشان دەچینە سەر باسی ئیسلام

چەمکی(شارستانیەت) لە ئیسلامدا جیاوازیەکی روون و ئاشکرای هەیە لە تێگەیشتنی ئەوروپا بۆی، ئەگەرچی لە خاڵی پێویست بوونی هەوڵدان بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی دا یەك بن بەڵام جیاوازە، ژیار لە تێگەیشتنی ئیسلامدا ئەو چالاکیەیە مرۆڤ پێی هەڵدەستێت لە زۆربەی بوارەکانی ژیانی دا

(١) (الكيس كاريل) لە کتێبەکەیدا(الانسان ذلك المجهول) دا کە پێشتر ئاماژەمان پێ کرد زۆر دوپاتی دەکاتەوە کە مرۆڤی هاوچەرخ ژیارێکی هەڵەی بۆ خۆی دورست کرد بە پاڵنەری خواست و ئارەزووەکانی بەڵام ئەمە گونجاو نەبوو لەگەڵ پێکهاتەی خۆی دا لەبەر ئەمە بەرێوەیە بەرەو تیاچوون و هەرەس هێنان.

تاوەکو ئامانج و بوونی بەدی بهێنێت.

لەبەر ئەمە دەبێت هەر لە سەرەتاوە ئامانجی بوونی مرۆڤایەتی بزانین تاوەکو هەموو نهێنی یەکانی(ژیار و شارستانیەت) دیاری بکەین کە دەگونجێ لەگەڵ ئەو ئامانج و بەدی هێنانەیدا.

شاعیر[١] نەفامی هاوچەرخ دەڵێت:

جئت لا اعلم من اين ولكني اتيت!

ولقد ابصرت قدامي طريقاً فمشيت

واتە: هاتم نازانم لەکوێوە بەڵام هاتم

پێشینەکانم ڕێگەیان دۆزیبویەوە منیش پێدا ڕۆیشتم

بەم شێوەیە ژیانی کۆتایی دێت بە(عەبەسیەت و بێ هودەیی) چونکە ئامانجی بوونی خۆی نەزانی و ئەمە بە راستی کێشەیەکی نەفامی هاوچەرخە کە نەفامی بەرەو شێتی دەبات هەر چەندە لە ڕێگەکەیدا بەردەوام بێت.

ئیسلام ئامانجی بوونی مرۆڤایەتی دیاری دەکات و ڕوونی دەکاتەوە و هەموو شتێکی ڕاست دەخاتە بەردەم مرۆڤ و لە شوێنی خۆیدا دایدەنێت:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾[٢].

﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴾[٣].

﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴾[٤].

---

(١) ئەو شاعیرە (إيليا ابوماضي)یە.

(٢) سورەتی الذاريات(٥٦).

(٣) سورەتی الانسان(٢).

(٤) سورەتی هود(٦١).

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾(١).

﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ﴾(٢).

﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ﴾(٣).

﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ﴾(٤).

**لەم ئایەتانە و هاوشێوەکانیەوە تێدەگەین مرۆڤ بۆ ئەوە بەدیهێنراوە خودا بپەرستێت و ببێت بە جێنشین لەسەر زەوی، هەروەها بۆ تاقی کردنەوەو بەلاَ بەسەرداهاتن، هەروەها تاوەکو هەندێ خۆشی لە ژیانی دنیا وەربگرێت، دروستکراوەکانی زەوی ئاوەدان بکەنەوە بە هەوڵ و گەڕان بە قەراغ و لاکانیداو لە رۆزی خودا بخۆن و هەوڵ بدەن بۆ وەگەڕخستنی ووزەی ئاسمانەکان و زەوی...**

**هیچ دژ بەیەك بونێك لە نێو هەموو ئەم ئامانجانەدا نیە، هەمووی لە کۆتاییدا لە ژێر چەمکی پەرستن لە ئیسلام دا یەك دەگرێتەوە. خودا مرۆڤی دروست کردووە تاوەکو خۆی دەستەلاَتدارو گەشە پێدەرو بنیاتنەرو ئاوەدان کار بێت لەسەر زەوی، هەروەها خودا دەزانێ کە ئەم کارە بوونێکی مرۆیی دەوێت کە چەند پاڵنەرێکی بەهێزی تێدا بێت تاوەکو پاڵی پێوە بنێت بۆ ئەم چالاکییەو کۆسپەکانی کۆڵی پێ نەدەن لەجێ بەجێ کردنی ئەرکەکەی: نە دەریا و نەرووبارو نەچیاکان و نەسەرماو نەگەرما و نە نەخۆشی.. هەروەها**

---

(١) سورەتی البقرة(٣٠).

(٢) سورەتی الملك(١٥).

(٣) سورەتی الجاثية(١٣).

(٤) سورەتی البقرة(٣٦).

خودا داناو زانایە کە ئەو پاڵنەرانە (یان بڵێن ئارەزووەکانی) لەگەڵ ئەوەی پێویستیەتی و لەگەڵیدایە، بەلام ناکرێت مرۆڤ جڵەوی بۆ شل بکات و هەتا کوێی بوێت مرۆڤەکە لەگەڵیدا بڕوات، چونکە لەبری ئەوەی یارمەتیدەری بێت بۆ تەواوکردنی کارەکەی لەناوی دەبات، لەبەر ئەوە چەند هێڵێکی بۆ ئەم ڕابواردنانە دیاری کردووەو، دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا﴾

﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا﴾(١) هەروەها شوێنی تاقیکردنەوەی مرۆڤی کردووە بەوەی ئایا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودایەو، لە ڕابواردندا ئەو سنورانە نابەزێنێت کە خودا بۆی داناوە؟ یان لە پێناو خواستی خۆیدا سنورەکان دەبەزێنێت؟

هەموو ئەم کارانەی کردووە بە(پەرستن) ، کە خودا لەو پێناوەدا دروستی کردوون بەشێوەی(حصر) پاشان لە دەربڕینی ئایەتەکەدا(نفي) (استثناء) بەکارهێناوە﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ کە﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا ﴾کە(ما-لا) بەهێزترین ئامرازەکانی(حصر) لە زمانی عەرەبیدا پاشان خودا بۆ ئەوانەی گوێڕایەڵی ئەم پەرستنانەو خودا پەرستی دەبن بە مانا گشتگیرەکەی بەهەشتی نەبڕاوەی مسۆگەر کردووە و هەر کەس یاخی بێت و پشتی لێ بکات و شوێنی هەواو ئارەزووەکان بکەوێت بە نەمری لە دۆزەخدا دەیهێڵێتەوە.

---

(١) تێبینی دەکەین ئەگەر ئارەزووەکە زۆر بەهێز بوو خودا دەفەرموێت ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا﴾ سورەتی البقرة(١٨٧) چونکە نزیک بوونەوەی ئیماندار لێ ی تووشی هەڵەی دەکات بەلام ئەوانەی زیاتر دەتوانرێ دابمرکێنەوەو تووشی هەڵەی ناکات دەربارەی دەفەرموێت ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا﴾ سورەتی البقرة(٢٢٩).

ئەمە چیرۆکی مرۆڤە لەسەرەتاو دەستپێکەوە تا کۆتایی... هەموو شتێکی ژیانی بۆ دیاری دەکات لە ساڵانی پێگەیشتنی کە لەسەر پێویستبوون (تکلیف)ی دەکەوێتە سەر، تا دەگەڕێتەوە بۆلای خودا خۆی، هەر ئەمە چەمك و تێگەیشتنی لە(شارستانیەت) بۆ دیاری دەکات کە پێویستە هەوڵ بدات بۆ بنیات نانی، داواکاریەکە تەنها ئاوەدان کردنەوەی ماددی زەوی نیە ئەگەرچی ئەمەش دەگرێتەوە، بەڵکو بە شێوەیەکی دیاریکراو جەخت دەکاتەوە: ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەپێی پرۆگرامی پەروەردگار لەو روانگەیەوە ئامانجەکانی بوونی مرۆیی بەدی دەهێنێت، چونکە بەم شێوەیە دەچێتەوە ژێر چەمك(پەرستن)ی فراوان کە ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە:

﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ ﴾[1].

پرۆگرامی پەروەردگار ئەم ئایینەیە!

﴿ إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ﴾[2].

﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾[3].

لێرەدا ئایین ژیارو شارستانیەتە و.. شارستانیەت و ژیار ئیسلامە!

ئەمەبوو تێگەیشتنی موسڵمان لێی، لە کاتێکدا چاکترین و جوانترین شارستانیەت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دروست کرد.. ئەو شارستانیەتەی(مرۆڤ) لە کۆیلایەتی و بەندایەتی جگە لە خوداو، لە نەزانین و ئەفسانەو خورافیات و، لە خۆپەرستی و دەست بەسەرداگرتن و، لە پەرستنی هەواو ئارەزوو و

---

(١) سورەتی الانعام(١٦٢-١٦٣).

(٢) سورەتی ال عمران(١٩).

(٣) سورەتی ال عمران(٨٥).

غەریزەکان لەهەمموو جۆرەکانی ستەم(سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی..) ستەم کردن لە خۆی و لەکەسانی تر رزگاری کردو، ئافرەتان و کۆیلەکانی ئازاد و سەرفراز کرد، خەڵکی بەرز کردەوە بۆ ئەو ئاستەی شایستەو شیاوی مرۆڤە.

کەواتە سەنگ و پێوانە ئایینەو! ئیسلامە! چونکە ئامانجی بوونی مرۆڤایەتی دیاری دەکات و پاشان شێوازی ئەو چالاکیانەی ئەو ئامانجە بە جوانترین شێوە بەدی دەهێنێت.. ئەمە شارستانیەتی ڕاستەقینەو شیاوە بە مرۆڤ.

ئیتر لەبەرچی هەندێ لە(موسڵمانان) رووی خۆیان و دڵەکانیان و بیرکردنەوەیان لەم شارستانیەتە ڕاستەقینەیە وەردەگێرن کە سەنگ و پێوەری ڕەوایە تاوەکو پێوەرو سەنگێکی کەم و کورت وەربگرن کە ئەوروپا لەبەر بارودۆخی تایبەتی خۆی پێوەی گلاوەو بڕاوە بەسەریدا؟!

بۆ ئەوەی گومانی باشیان پێ بەرین دەڵێین واقعی ئەمڕۆی موسڵمانان لەوپەری خراپی دایە، ئەمە هۆکاری ئەو وەرگەرانەی ئەوانەیە لە چەمکە ڕاستەقینەکەی شارستانیەت و، لەبری سەنگ و پێوەری ئەوروپایان وەرگرتووە کە ئایین کۆسپی شارستانی بوونەو بانگەشە دەکات بۆ وەلانانی ئایین تاوەکو ژیان بەرەو پێش بچێت.

بەڵام هەر چەندە بمانەوێت گومانی باشیان پێ بەرین ناتوانین بیکەینە بەهانە بۆیان! چۆن بەهانە بێنینەوە بۆ کەسانێك گوێبیستی وتەکانی خودان و پشتی تێ دەکەن و دەڵێن: پێوەر و سەنگی ئەوروپا لە بری وتەکانی خودا وەردەگرین و پەیرەو دەکەین؟!

خۆ خراپ بوونی واقعی موسڵمانان ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەستیان بە ئایینەکەیانەوە گرتووەو پەیڕەوی دەکەن بەڵکو هۆکارەکەی دووریانە لە ئایین. لەبەر ئەمە ئەم بۆچوونە ناشارستانیانەیە، چونکە رۆژگارێك ئایینەکەیان

بەجوانی دەناسی و بە بەرچاو روونیەوە دەستیان پێوە گرتبوو ئەو کاتە میللەتێکی دیاری شارستانی سەر زەوی بوون، لە ئەمڕۆدا تاکە ڕێگایان بۆ گەڕانەوە بۆ لای شارستانیەتی ئەمڕۆ ئەوەیە بگەڕێنەوە بۆ لای ئاینەکەیان، کە هەموو پایەکانی شارستانیەتی تێدا دەبینێتەوە، یەکەمیان ناسینی خوداو پەرستنی و شوێن کەوتنی ئەوەی خودا ناردوویەتی.

ئەو پاش کەوتنە زانستی و ماددی و سەربازی و سیاسی و ئابووری و رەوشتی یەی هاتۆتە ئاراوە کە پێکەوە(دوا کەوتووی شارستانی) پێك دەهێنێت پەتا رەسەن و سەرەکیەکەی ئەم میللەتە نیە، وەك هەندێك وا تێ دەگات گواستنەوەی شارستانیەتی رۆژئاوا بۆ رۆژهەڵات ئیتر لەدواکەوتوویی رزگاری دەکەن و بەشێوەیەکی نوێ گەشەی پێ دەکات!

ئەم دواکەوتنە، بەهەموو بەشەکانی و شێوازەکانیەوە دەرئەنجامی دواکەوتنی بیروباوەڕە لە دەروونی موسڵماناندا، چونکە ئەو بیروباوەڕە بوو پێشکەوتنی زانستی و ماددی و سیاسی و ئابوری و ئەخلاقی بۆ موسڵمانان فەراهەم هێنا... لە رۆژگارێکدا کە بەڕاستی ئیمانیان بەم ئایینە هەبوو.

ئەوانە واقعی خراپی موسڵمانان دەکەن بە بیانوو بۆ لابردنی شەریعەتی ئیسلامی، ئەمانە جگە لەوەی لە ڕووی رۆحی و فیکری یەوە بەرانبەر بە رۆژئاوا دۆڕاون و تێك شکاون بە ڕاستی و نهێنی یەکانی مێژوو نازانن و بێ ئاگان، هەروەها بێ ئاگاو نەزانن لەبەرانبەر سووننەتەکانی پەروەردگار کە حوکمی ژیانی مرۆڤ دەکات لەسەر زەوی.

ئەو قسانە دەکرێ و دەوترێتەوە گوایە سزاکانی شەریعەتی ئیسلامی ڕوخسارێکی(ناشارستانی یە!) ئەگەر گونجاو بووبێت لەگەڵ ژینگەی دەشتەکی کە تێدا هاتۆتە خوارەوە، ئەمڕۆ ناگونجێ لەگەڵ ئەم ژینگە شارستانیەی دانیشتوانی جیهانی نوێ تێیدا دەژی! ئای چەندە دڕندانەو تۆقێنەرە دەستی

دز بېڕدرێت! یان زینا کەر بەرد باران بکرێت! بەڵکو بەند کردن سزایەکی رێك و پێك و شایەن بە شارستانی بوونە! یان ئەگەر بیانەوێت با هەر سزا نەمێنێ!

لەوانەی دەوترێتەوە: شەریعەتی ئیسلام ستەم لە ئافرەت دەکات و، ئەو ئازادی و مافانەی شارستانێتی نوێ پێی بەخشیووە پێی رەوا نابینێ و قەدەغەی دەکات لێی، نامانەوێ ووتەکانی لە پێشتر باسمان لێوە کرد لە کاتی خستنەڕووی مەسەلەی پەرەسەندن دا دوو پات بکەینەوە، بەڵام ئەوەندە بەسە دەڵێین ئەم شەریعەتە تاکە شەریعەتە لەسەر زەوی بابەتی تاوان و سزادانی لە هەموو لایەکەوەو لە یەك کاتدا لەبەر چاو گرتبێت، لەگەڵ ئەمەشدا ئیسلام یاساو دەستورێکی واقعی یەو کەش و هەوا پڕ بێت لە میکرۆب گریمانەی هێزی بەرگری بۆ خەڵك لەبەر چاو ناگرێت و دایناٽێت بەڵکو هەر لەسەرەتاوە میکرۆبەکان ناهێڵێت دڵ پەروەردە دەکات و بەرگری بۆ بەرهەم دەهێنێت.

دزیکردنی میکرۆب و ڤایرۆسەکەی برسێتی و هەژاری یە، یاساو دەستوری ئیسلامی هەوڵی نەهێشتنی برسێتی و هەژاری دەدات بەو یاسایانەی دای ڕشتووەو رێکی خستووەو بە هەموو رێنماییەکانی هەوڵ دەدات تاوەکو برسی نەمێنێت، تاوەکو لەبەر برسێتی پەنا نەبردرێتە بەر دزی کردن.

هەروەها زینا کردن لە ئەنجامی میکرۆبی خۆ دەرخستن و ووروژاندن و خۆرازاندنەوەو خۆ رووت کردنەوەو، هەروەها نەفامی ئەو بەها جددیانەی هەست و ووزەکانی خەڵك دەتوانێت بیخەنەگەڕ، هەروەها ڕابواردن و لاوازی لە جڵەوگرتنی ئارەزووەکاندا روو دەدەن، ئیسلام هەموو ئەمانەی قەدەغە کردووەو دژیان دەوەستێت لەبەرانبەردا داوا دەکات زوو خۆیان دابمەزرێنن بەهاوسەرگیری هەوڵی ئاسانکاری بۆ داوە تاوەکو کارەکان بکەونە سەر رێی سروشتییان و ڕاستە رێ بن و چیتر کەس پێویستی بە تاوان نابێت.

لە هەموو سزاکانی تردا بەم شێوەیە یاساو دەستوری ئیسلامی هەوڵی

گرتنی کەلێن و سەرچاوەکانی تاوان دەدات پێش ئەوەی لە کەش و هەوادا میکرۆبەکانی بڵاوە بکەن.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئیسلام لە هەموو حاڵەتێکدا بە شێوەیەکی تاك و جیا دەڕوانێتە بارودۆخەکە: ئایا تاوانبار بەهانەی هەیە؟ یان گومان هەیە، ئەگەر هەبوو سزاکە بەو هۆیەوە هەڵدەگیرێت، سزا جێ بەجێ ناکرێت تاوەکو دڵنیاو بێ گومان نەبن لەوەی ئەنجام دەری تاوانەکە هیچ بەهانەیەکی نی یە، ئەمە هەڵس و کەوتی عومەر(رەزای خوای لێ بێت) بوو کاتێك سزای دزی لە ساڵی گرانی و ووشکە ساڵیەکەدا ڕاگرت، کاتێك چەند کۆیلەیەکیان هێنایە لای حوشترێکیان دزی بوو سزای لەسەر جێ بەجێ نەکردن، بەڵکو گەورەکەی ناچار کردن دوو قات نرخی حوشترەکە ببژێرێتەوە و بیداتەوە بە خاوەنی حوشترەکە وەك سزایەك بۆی لەسەر برسی کردنی کۆیلەکانی و پێی ووت:

سوێند بەخوا ئەگەر نەمزانیبایە کە ئێوە کاریان پێ دەکەن و برسیان دەکەن هەتا یەکێك لەوان وای لێ دێت لە حەرام کراوەکان دەخوات و بۆیان حەڵاڵ دەبێت ئەوا دەستم دەبرین ئەگەرنا بەتۆی دەبژێرم بەشێوەیەك داخ ببیت پێی! پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لای خاوەن حوشترەکە و پێی وت: حوشترەکەت نرخی چەند بوو؟ وتی چوار سەد، بە ئیبن حاطبي(خاوەنی کۆیلەکان)ی وت: برۆ هەشت سەدی پێ بدە[1]. ئەو سزایەی خۆی لە خۆیدا ئامرازی پاراستنە لە تاوان و، ئەو ئەو توندیەی تێدا بەدی دەکرێت ومەبەست لێی ترساندنە بۆ ئەوە دەروونی پاڵی پێوە نەنێت بۆ ئەو تاوانە، ئیسلام سەرەتا دەستی نەکردووە بە ڕاپۆرتی سزاکان و ئیمزاکردنی سزاکە.

بەڵکو سەرەتا بەپاراستنی کۆمەڵگا لە تاوان دەست پێ دەکات، بەدەست

---

(١) طبراني گێراویەوە.

گرتن بەسەر ئەو سەرچاوە و چاوگانەی لێی هەڵدەقوڵێت، یەکەم کەلێن کە دەیگرێت دڵی مرۆڤ خۆیەتی سەرچاوەی چاکەیە ئەگەر چاکبکرێت و سەرچاوەی خراپەیە گەر خراپ بوو:

(الا وان في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله وإذا فسدت فسد الجسد كله الا وهي القلب)[١].

(لە جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر چاك بوو هەموو جەستە چاك دەبێت، ئەگەر خراپ بوو هەموو جەستە خراپ دەبێت ئەو پارچە گۆشتە دڵە).

ئیسلام هەوڵ و کۆششی یەکەمی رووەدەکاتە ئەم دڵە تاوەکو پاك و بێ گەردی بکات و، بە دوو شت پەیوەستو وا بەستەی خودای بکات(ترس و تکا):

﴿وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ﴾[٢].

ئەو ناوو سیفەتانەی لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) هاتوون بۆ پەروەردەکردن و پاڵفتە کردنی ئەم دڵەو بەستنەوەیەتی بە خوداوە، چونکە لە هەموو لایەنەکان و بارودۆخەکان و هەموو هەڵس و کەوتەکاندا دەوری دڵی داوە، ئەگەر شتێکی وویست بەدەستی خودایەو لە شتێك ترسا هەمووی لە دەستی خودایە، خۆی رۆزی دەرەو بەتواناو هەڵسورێنەرەو، هەر خودایە جڵەوی هەموو شتێکی لەدەستدایەو لێبوردەو بەبەزەیی یە لە دوا رۆژدا بۆ ئیمانداران و، بەدەستەڵات و گەورەترینە هەر خۆی دروستکراوەکانی بەدیهێناوە و دووبارە دروستیان دەکاتەوە، لە لای ئەوەوە هاتووین و بۆ لای دەگەرێینەوە.

(١) متفق عليه.

(٢) سورەتی الاسراء(٥٧).

کاتێك دڵ لەسەر ئەم پەروەردەیە گۆش بکرێت هەر لە بنەڕەتەوە بەلای تاوان دا ناچێت، چونکە لە لێپرسینەوەی خودا دەترسێ‌وئارەزووەکانی خۆی کۆنترۆڵ دەکات‌و، هەست بەقەناعەت‌و رازیبوون بەبەشی خۆی دەکات لەوەی لە فەزڵی خۆی پێی داوەو، گەر خواستی زیاتری هەبوو هەر لەلای خودایە.

ناڵێین پەروەردەی ئیسلامی خەڵکی کردووە بە فریشتە، بەڵام وویست و پاڵنەرە خراپەکان لە دەروونیاندا هەڵدەکەنێ، دڵەکان جارێکی دی ناگەرێنەوە سەر کینەو رِق و تووڕەیی و دڵ ڕەشی، چونکە ئەوی تر تەنها لە بەهەشتدا دێتە دی:

﴿وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾[١].

بەو پەڕی دڵنیاییەوە دەڵێین: کۆمەڵگای ئیسلامی گەر بەڕاستی کۆمەڵگایەکی ڕاستەقینەی ئیسلامی بێت کەمترین تاوانی تێدا روودەدات بەبەراورد لەگەڵ کۆمەڵگاکانی تری سەر زەوی، هۆکاری یەکەم دەگەرێتەوە بۆ ئەو پەروەردەیەی دڵ بە خوداوە دەبەستێتەوەو خۆشی دەوێت و لێی دەترسێت.

بەبی بیانوو و بەهانە لەبەر ئەوە چەندەها و چەندەها جار بیری لێ دەکاتەوە پاشان جی بەجێی دەکات.

لە ئیسلامدا گەر سزا بەسەر تاوانبارێکدا دەسپێنرا -هیچ بیانوو بەهانەیەکی نەبوو- دواتر لەبەر تاوانەکەی وەلا نانرێت بەڵکو سزاکە بۆ پاك

---

(١) سورەتی الاعراف(٤٣).

بوونەوەیەتی: فمن اصاب من ذلك شیئاً فعوقبت به في الدنیا فهو له كفارة[١].

(هەر کەسێك ئەم کارانەی بەسەردا بێت و لە دونیادا سزا بدرێت ئەوا پاککردنەوەیە لە تاوانەکەی).

بەم شێوەیە ئیسلام پەڕەیەکی نوێ و سپی و پاك هەڵدەداتەوە بۆی و، ئیتر لەسەر ئەو کارە تانەو تەشەری لێ نادرێت و دەستی بۆ راناکێشرێت و لە پشتەملەوە باس ناکرێتو هەموو دەروازەکان بەروویدا داناخرێت، تاوەکو وای لێ بێت بگەڕێتەوە سەر تاوانەکەی دووبارە.

هەموو ئەو یاسایانەی لەسەر زەوی هەن بەکۆن و نوێ یەوە کامەیان بەم شێوەیە لە هەموو لایەکەوە بابەتی تاوان و سزای گرتۆتەوە و گشتگیرە لەهەموو لایەنەکانیەوەو، یاسایەکی هاو وێنەیان داناوە وەك ئەمەی شەریعەت؟ لەگەڵ ئەمەشدا پشتی تێ دەکەن و دەیگۆڕن بە یاسایەکی تر؟!

﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾[٢].

کامەیان چاکترە؟ کۆمەڵگایەکی خاوێن هیچ تاوانێك تێیدا روونادات تەنها چەند ڕیزپەڕێك(شاذ) نەبێت کە سەرزەنشت دەکرێت، یاخود کۆمەڵگایەکی نقوم بوو لە تاوان و، هەموو دەزگاکان لە هەوڵی ڕێگە لێ گرتنی دان یان سنووردارکردنی بەڵام ڕۆژانە لە زیاد بووندایە؟!

کامەیان کۆمەڵگی شارستانی یە؟ ئەو کۆمەڵگایەی سەرۆکی دەوڵەت بە میللەتەکەی و گەل دەڵێت: لە دوای ڕۆژئاوا بوون بەتەنیا دەرمەچن و زیاتر لە

---

(١) اخرجه البخاري.

(٢) سورەتی المائدة(٥٠).

سی دۆلار هەڵمەگرن تاوەكو لە دەستی تاوانبارەكان رزگاربن[١] یان ئەو كۆمەڵگایەی، كە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە بارەیەوە دەفەرموێت:

(والله لیتمن الله هذا الامر حتی یسیر الراكب من صنعاء الی حضرموت لایخاف الا الله والذئب علی غنمه)[٢].

(سوێند بەخوا خودا كاری ئەم ئایینە تەواو دەكات بەجۆرێك سوارێك لە(صنعاء)ەوە بۆ(حضرموت) دەڕوات و تەنها لەخوادا دەترسێ و پاشان لە گورگ دەترسێ بۆ سەر مەڕەكانی).

## مەسەلەی ئافرەت و شارستانیەت

بابەتێكە درێژە دەكێشێ[٣]، بەلآم لە چەند ووشەیەكدا كورتی دەكەینەوە، بەڕاستی لە كۆمەڵگای رۆژئاوادا ئافرەت بە سوك سەیر دەكرا و، وەك مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵدا نەدەكرا، لە زۆربەی مافەكانی بێ بەش كرابوو، هەندێ لە فەیلەسوفەكان لە مقۆ مقۆی ئەوە دابوون دەربارەی: ئایا رۆحی هەیە یاخود بێ رۆحە؟ ئەگەر رۆحیشی هەیە ئایا رۆحەكەی مرۆڤانەیە یان ئاژەڵانەیە؟ ئەگەر رۆحەكەی مرۆڤانەیش بێت ئایا لە هەمان ئاستی رۆحیانەتی پیاوان دایە یاخود كەمترە!

ئەو خەڵوەتگەرییە(رەهبانیەت)یەی كەنیسە دایهێنابوو كاریگەری هەبوو

---

(١) لە بانگەوازەكانی سەرۆك(رێگان) بوو سەرۆكی ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بۆ گەل لە كاتی دەست بەكاربوونی و گۆڤارەكانی ئەو كاتە بلآویان كردەوە.

(٢) اخرجه البخاري.

(٣) ئەگەر وویستت بڕوانە(مذاهب فكرية معاصرة) بەشی(دور يهود).

لەسەر تێڕوانینی کۆمەڵگا بۆ ئافرەت، گوایە تەون و تۆڕەکانی شەیتانەو دەبێت بەردی لەسەر دابنرێت تاوەکو ئەو کەلێنانە بگیرێت شەیتان لێوەی دێت و، بەهەموو شێوەیەك لغاو بکرێت تاوەکو شەیتان لە ناویدا بەند بکرێت و بشاردرێتەوەو لە رێگەیەوە نەچێتە دڵی پیاوانەوە.

ئافرەت ڕاپەری، یاخود بە مەبەستێك وورووژێنرا (ئازادی وەرگرت)- یاخود بڵێین حەڵاڵ کرا- لە هەموو کۆت زنجیرەکان رزگار بوو، بووە گێژەڵووکەیەکی تووڕەو هاتە سەر رێگا، وەك لە رۆژئاوادا دەبینین و پێویستی بە روونکردنەوە نیە.

پوختەی گفتوگۆکەمان لێرەدا ئەوەیە ئافرەتی رۆژئاوا خەریکە بەهۆش دێتەوەو ووریا دەبێتەوە کەوا پیاو بەرەڵای کردووەو تاوەکو پێی رابوێرێت و کەرامەت و مرۆڤایەتی بڕوشێنێت و، وەك بازرگانیەکی قازانجدار لە رێگەی وورووژاندنی ئارەزووەکان و هەواو هەوەس و شەهوەتەوە بۆ خۆیان دەیقۆزنەوە، هەر چۆن بەرەڵای کردووە تاوەکو لە ئەرك و کارەکانی خۆی رزگار بکات و بیدات بە کۆڵی ئافرەتی(ئازاد)دا! هەر بۆیە هەندێ ئافرەتی زیر دەستیان کردووە بە بانگەشە کردن تاوەکو ئافرەت بگەڕێتەوە بۆ شانشینەکەی خۆی کە بەجێهێشتبوو، واتە ماڵەکەی و بۆ سەر کارە سەرەکیە مەزنەکەی کە پشت گوێ خستبوو بە هەڵەداوان بە دوای هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی و خۆشبەختی دەگەڕا ئەویش چاودێری نەوەی نوێ بوو، لە دوای ئەوەی ماڵی جێگیرو دایك نەما ئەمانیش لەناوچوون و وون بوون...

ئەمەو لە میانەی چەند چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی فەرەنسی کە لە ماوەی یەك ساڵ دا لەگەڵ ئافرەتانی پیشەدار دا ئەنجامی دەدا زۆربەیان پلەی بەرزیان هەبوو لە کۆمەڵگاداو پایەدار بوون، زۆرینە خۆزگەو ئاواتە گەورەیان ئەوەیە بگەڕێنەوە بۆ ماڵ و ئەم ئەرکەی کراوەتە کۆڵیان وازی لێ بێنن! هەروەها خۆپیشاندانێك لە ئەمریکا لە لایەن ئافرەتانەوە ئەنجامدرا دژ بە

نمایشکردنی جلی ژێرەوەی ئافرەتان لە رووی پێشەوەی دوکانەکانداو لەبەر کردنی بۆ( بوکەڵەکان-پەیکەرەکان) و پێیان وابوو سووکایەتیکردنە بە ئافرەت و پیس کردنی کەرامەتیەتی.

ئیسلام ئەو ئایینەیە رێزو کەرامەتی مرۆڤانەی بە ئافرەت رەوا دەبینێت و، لە ستەمی نەفامی رزگاری کردو لە هەمان کاتدا دەیپارێزێت لەو سەر شۆرشیەی هێنرا بەسەر ئافرەتی رۆژئاوا، لە نرخی ئەو سەربەستیەی بەدەستی هێنا هەتا ئێستا هەندێ وولاتی رۆژئاوای(شارستانی)دا ئافرەت لە هەندێ مامەڵەدا ناتوانێ راستەخۆ بەشدار بێت لە کاتێکدا ئیسلام مافی مامەڵەی راستەوخۆی پێ بەخشیوەو، ئەوان وای لێهیاتووە کاتێك هاوسەگیری دەکات ناوەکەی لە دەست دەدات و دەبێت بە(مدام فلان)! کە دەڵێن لە بنەڕەتی مێژوویی دا واتە(خاوەنداریێتی تەواو و ئازاد لە مامەڵە کردن پێی[1]!

بەڵام ئیسلام بڕیاری یەکسانی پیاو و ئافرەتی داوە لەوەی وەك یەك مرۆڤن و لە پاداشتی دوا رۆژدا وەك یەکەن:

﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِى سَبِيلِى وَقَٰتَلُوا۟ وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ﴾[2].

---

(١) هەندێ لە قامووسە زمانەوانیەکانی ئەوروپی دەڵێن ووشەی(مدام madame) لە بنەڕەت دا my domain یە واتە شت و مەکانی مرۆڤ کە دەستەڵاتی تەواوی هەیە بە سەریدا! ئێمە بەڵگەمان بۆ چەسپاندن یان رەت کردنەوەی ئەم مانایە نی یە ئەگەرچی واقعی ژیانی ئەوروپی لە سەدەکانی ناوەڕاست دا ئەمە دەردەخەن!

(٢) سورەتی ال عمران(١٩٥).

هەروەها تێڕوانینی بۆ ئافرەتی ئیماندار بەو جۆرە نیە کە شەیتانە، بەڵکو هاوبەشی بنیات نانی کۆمەڵگایە لەسەر بناغەیەکی پتەو:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾(١).

لە راستیدا ئەوەی بەناو(شارستانی و پەرەسەندن) لەسەربەست کردنی ئافرەت دا دەیانەوێ نە ئازاد کردنەو نەپاراستنی کەرامەت و رێزە بەڵکو هێنانەکایەی کۆمەڵگەیەکی داوێن پیسە تاوەکو هەرچی چێژو ئارەزوو هەیە بەبێ لەمپەرو کۆسپ و چاودێر بە تاڵان ببەن و ئەمانە خۆیان شەیتانەکانن!

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾(٢).

بەڵام ئەو دیاردە نەفامیانەی ئەمڕۆ لە کۆمەڵگای موسڵمانان دا سەبارەت بە ئافرەت بڵاوە چارەسەرەکەی گەڕانەوەیە بۆ لای پرۆگرامی راستەقینەی پەروەردگار نەوەك ڕاکردن بێت بۆ لای بەناو شارستانیخوازان و بیرۆکەی پەرەسەندن، ئەوانەی لە هەوڵی بڵاوکردنەوەی خراپەکاری و داوێن پیسین لەسەر زەوی و خودایش ئەمەی ناوێ.

---

(١) سورەتی التوبة(٧١).

(٢) سورەتی النور(١٩).

# دەروازەی پێنجەم

## "گومانی ئەوە کە ناتوانرێ شەریعەت جێ بەجێ بکرێت بە هۆی بوونی کەمە نەتەوە ناموسڵمانەکانەوە"

واتای ئەم گومانە بە ڕاشکاوانە ئەوەیە کەمینە ڕێگری لە زۆرینە دەکات بۆ پەیڕەوکردنی ئاینەکەی، ئەمە لە هەموو مێژوودا کەی وابووەو لەسەر چ بنچینەیەك وا دەبێت؟!

کەی لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتیدا مافی کەمینە بووە حوکمی زۆرینە بکات و پێی بڵێ تۆ نابێت پەیڕەوی ئاینەکەت ببیت کە باوەڕت پێی هەیە چونکە ئەمە مەترسی لەسەر بوونی ئێمە یاخود لەسەر مافەکانمان هەیە؟!

با بڕوانینە بارودۆخی موسڵمانە کەمینەکان لەم ڕۆژگارەی ئێستاو لە وڵاتەکاندا، یەك کەمینە لە کەمینە موسڵمانەکان لەسەر زەوی ئەم داوایەی نەکردووە یان دەری نەبڕیوە بەوەی داوا لە زۆرینەی فەرمانڕەوا بکات واز لە ئاینەکی بهێنێت لەبەر خاتری ئەوەی ئەمان لە نێوانیاندان.

بەڵام با وا دابنێین ئەم مەحاڵە رووبدات! کاردانەوەی زۆرینەی فەرمانڕەوا لە جیهاندا چی دەبێت ئەگەر کەمینەی موسڵمان ئەم داوا سەیرە پێش کەش بکات؟!

من وای بۆ دەچم کاردانەوەیەکی خێرای لە ئاسیاو ئەفریقیا بە قەسابخانەو کوشتارگە دەبێت بۆ موسڵمانان و رووباری خوێن هەڵدەستێت، هەروەها کاردانەوەکە لە جیهانی(ئازاد!)دا خۆپیشاندانی تووڕە روودەدات و داوادەکەن موسڵمانان لە وڵاتەکەیان دەربکەن! ئەم تێڕوانین و بۆچوونە ئەندێشەو خەیاڵێکی بێ راستەقینە نیە، هەر بە کرداری لە هیند کوشتارگە بۆ موسڵمانانە هیندیەکان دانرا نەك لەبەر ئەوەی پەنا بەخوا ئەم داوا شێتانەیان پێش کەش کردبێت بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەی موسڵمان بوون! تەنها لەبەر ئەو هۆیە ڕق و کینە و تووڕەیی بت پەرست و مانگا پەرستە هیندیەکانیان لێ هاتە

جۆش و هێرشیان کردە سەریان و ئەوەی کوژرا کوژراوماڵەکانیان ئاگر تێ بەردان و پاشان بە ساغ و دڵنیاییەوە گەڕانەوە بەبێ ئەوەی هیچ سزایەك بیانگرێتەوە!

هەروەها لە فلیپین خاچ پەرستەکان هاتن و موسڵمانیان لە خاکە دەوڵەمەندەکەیان دەرکردوو ناچاریان کردن بچنە زەویەکی ڕەقەڵان و ووشك و بێ سوود هەتا ئەمڕۆ هەر بەردەوامن و وازیان لێ نەهێناون لە تەنگ پێ هەڵچنیان تاوەکو دەریان بکەن و ئەوەندە زەوییەی بە دەستیانەوەیە لەچنگیان دەربهێنن، هێزی یاسایی دەوڵەت دەنێرن بۆ ئەوەی شەڕ لە دژیان بکەن بە ناوی(یاخیبوان) یاخیین بە ئاینەکەیانەوە! یان لەبەر ئەوەی موسڵمانن[1].

لە جیهانی شوعیەت دا لە روسیاو چین درندانەترین کوشتارگەو قەسابخانەی بە کۆمەڵیان بۆ دانراوە، ملیۆنەها کەس بە ئاشکرا بوونە

---

(١) فلیپین بە درێژایی چەند سەدەیەك زەوی ئیسلام بوو، پاشان خاچ پەرستەکان چاویان تێ بڕی تاوەکو بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، (ماجلان) داوای لە پاپا کرد سەرۆکایەتی ئەو هەوڵە بکات بۆ ئەوەی فلیپین بخاتە سەر موڵکی خاچ پەرستەکان بەڵام پاپا سێ جار ڕەتی کردەوە لەبەر ئەوەی متمانەی نەبوو ئەوە رووبدات لەبەر ئەوەی موسڵمانان هێزێکی ئاسنین و چەسپاوو بەهێزیان لەوێدا هەبوو، بەڵام دوای ئەوەی ماجلان زۆر داواکەی دووبارە کردەوە لە جاری چوارەمدا رازی بوو، دوای ئەوەی ماجلان وای دەرخست توانای جێ بەجێ کردنی ئەم پێشنیارەی هەیەو هەڵمەتەکەی دەست پێ کردوو سەرۆکایەتیەکەی گرتە دەست و کە ئەمڕۆ بە منداڵەکانمان دەڵێین( بە هۆی کاریگەری هێرشی فکری) کەوا گەشتێکی زانستی پشکنەرانە بووە ماجلان لەسەر یەکێك لە دورگەکانی موسڵمانان دابەزی و ئەو مافەی بەخۆی دا نیشانەی(خاچ)ی تێدا بەرزکردەوە موسڵمانانیش کوشتیان (هەر بەهۆی کاریگەری فیکری و داگیرکاری) وا لە منداڵەکانمان دەگەیەنین کەوا چەند درندە ئاسا (بەربەری) یەك لە فلیپین کوشتویانە و گەشتە زانستە پشکنەرانەکەیان بەهەند وەرنەگرتووە.

قوربانی و، ئەم کوشتارگانەیان ناونا(بزوتنەوەکانی پاککردنەوە)!

لە ئەفریقیا بارودۆخەکە لەوانی تر باشتر نەبوو.

**بانمونەیەك لەحەبەشە وەربگرین.**

زۆر کەس وای بۆ دەچێت موسڵمانانی حەبەشە کەمینەن ئەم گومانەش خۆی لە خۆیدا هۆکاری هەیە! بەهۆی ئەو سوکایەتی و چەوساندوەیەی بە موسڵمانانی ئەوێ دەکرێت و، ئەو ژێر دەستەیی ماندووی کردون وای کردووە وابزانرێت کەمن لە کاتێکدا لەسەدا شەست و پێنجی دانیشتوانی پێکدەهێنن(پێش ئەوەی ئەریتیریا بخرێتە سەر حەبەشە و زۆربەی ئەوانیش موسڵمانی چەوساوەو بێ دەسەلاتن)! پاشان ئەو حەبەشەی خاچ پەرست فەرمانڕەوای دەکات سەرباری ئەوەی موسڵمانەکان زۆرترن هەوڵی دا ئەریتریای موسڵمانیش بخاتە سەر وولاتەکەی خۆی تا موسڵمانان بچەوسێنێتەوە و سەرشۆریان بکات و لە ئایین و بیروباوەرەکەیان دایانماڵێت سەدان هەزاری لێ کوشتن و ملیۆنەهای دەربەدەر کردوو هەتا ئێستا کوشتن هەر بەردەوامە تەنها لەبەر ئەوەی موسڵمانن!

هەر لە حەبەشەدا(زۆرینە)ی موسڵمانان بە تەواوەتی لەهەموو مافێکی سیاسی بێ بەشەو، ئەگەر بەپێوەری حوکمی زۆرینە بوایە دەبوایە فەرمانڕەوا بوایەو، نەیتوانیوە ئەوە بکات و تەنها وەزیرێکی لە حوکم دا نیە یان کەسێکی خاوەن پلەیەکی دیاری نیە.

هەروەها ناتوانێ ئیسلام فێری منداڵەکانی بکات لە قوتابخانەکاندا چونکە خاچ پەرست سەرپەرشتی دەکات، هەروەها روخسەتی کردنەوەی قوتابخانەیان پێ نادەن تاوەکو منداڵەکانیان فێری قورئان و ئایین بکەن تەنها چەند نوسینگەو شوێنی بچووك نەبێت کە لە ژێر باجدا ئەوەندە زۆریان بۆ هێناون هەتا وایان لێ دێت دادەخرێت، هەروەها کۆمەك و یارمەتی دارایی لە دەرەوەی

وڵات ناهێڵێت بەم حەبەشە موسڵمانانە بگات تاوەکو قوتابخانەی ئیسلامی پێ بکەنەوە بۆ فێرکردنی موسڵمانان و رۆشنبیرکردنیان بە رۆشنبیری ئیسلامی.

هەموو ئەمانەی باسمان کرد لە کاتێکدایە موسڵمانان زۆرینەن، وای بە حاڵیان ئەگەر کەمینە بوونایە... و چی رووی دەدا ئەگەر داوایان بکردایە لە کاتێکدا ئەمان زۆرینەن کەمینەی خاچ پەرستی فەرمانڕەوا ئایینەکەی خۆیان پیادە نەکەن؟!

زنجبار دەوڵەتێکی موسڵمان بوو لە ئەفریقیادا، خاچ پەرستەکان و مەسیحی بە بوونیان بێزاربوون، تەنها لەبەر ئەوەی موسڵمان بوون رۆژێك لە رۆژە رەشەکاندا هێرشیان کردە سەریان و سێ یەکی دانیشتوانەکەیان سەربڕی و، ئەوەی مایەوە بەزیندوویی بە سوکایەتی و سەرشۆڕکردنیان خستیانە پاڵ دەوڵەتێك لە ژێر فەرمانڕەوایی مەسیحیەکاندا بوو، ناونرا(تنزانیا) کە پێشتر ناوی(تنجانیقا) بوو وەك یادەوەریەك لە تیرۆرکردنی زنجبار بەهێشتنەوەی دوو پیت لە ناوە نوێ یەکەی دەوڵەتەکەدا[١].

ئەفریقیا پڕە لەو دەوڵەتە موسڵمانە زۆرینانەی کە کەمینەی مەسیحی جڵەوی فەرمانڕەوایی لە دەستدایە و بە دوژمنکاری و چەوساندنەوە حوکمیان دەکەن و، ئەڵقە لە گوێی(جیهانی ئازادن) و بەڵکو جیهانی(ئازاد و سەربەست!) هانیان دەدەن و پشتگیری ئەو چەوساندنەوەیان دەکەن بۆ سەر موسڵمانەکان.

بەڵام خودی ئەم جیهانی ئازادانە شتی سەیرو سەمەرەیان لێوە دەبیستین! لە فەرەنسای ئێستادا بە سەرۆکایەتی(لۆبان) بانگەیەشەیەکی زۆر کرا کە

---

(١) (ت – ن) لە ناوی دەوڵەتە نوێ یەکەدا(تنزانیا) ئاماژە بە تنجانیق و(ز – ن) ئاماژە بە(زنجبار) دەکەن و ئەو پیتانەی تر دەمێنێتەوە لە(ی – ا) بۆ پێکهێنانی ناوە نوێ یەکەیە بەڵام لە ڕاستیدا هەر لە(تنجانیقا)وە وەرگیراوە و هیچ پەیوەندیەکی بە(زنجبار)ەوە نی یە.

یەکێك بوو لە پاڵێوراوان بوو بۆ فەرمانڕەوا کردنی فەرەنسا کەوا پەیمان دەدات بە دەرکردنی موسڵمانەکان لە وولاتەکەیان، ئەم بزووتنەوەیە کاری زۆر درندانەی ئەنجام دا لە کاتی رۆیشتنی شەمەندەفەری(مترۆ)دا پێنج موسڵمانیان هەڵدایە دەرەوەو یەکسەر گیانیان لە دەست دا، پاشان خۆپیشاندەرانیان هاندا هەڵبکوتنە سەر موسڵمانان -بە تایبەت ئافرەتە داپۆشراوەکان -و لەسەر شەقام و ڕێگاکانی پاریس شاری پرشنگدار و یەکێك لە گەورەترین پایتەختەکانی جیهانی(سەربەست و ئازاد!) ئەمە لە کاتێکدا موسڵمانان لەدوای مەسیحیەکان زۆرینەی پلە دووەمن و ژمارەیان پێنج ملیۆن کەس دەبێت.

لە لایەکی ترەوە بەریتانیا هەڵدەستێت بە پاراستنی ئەو(ئومێدەیان سەلمان روشدی) کتێبی(ايات شيطانية)یەی نوسی و تێدا بە ناشیرین ترین و قێزەونترین شێواز جنێو بە پێغەمبەر و هاوەڵەکانی و کەس و کارەکەی دەدات لە سنوری رەوشتی(هونەری) و ئەدەب و زانستی و هەست دایماڵیوەو هیچ ڕەوشتێکی نوسینی ڕەچاو نەکردووە، کاتێك موسڵمانان نارەزایی دەردەبڕن لەسەر چاپ کردنی ئەم کتێبە دەوڵەت بە راشکاوانەو بە یەك ووشە دەڵێت: ئەمە یاسای(دیموکراتیەکەمانە) هەر کەس بەدڵی نی یە با وولاتەکەمان بەجێ بهێڵێت، لە کاتێکدا لە دوای مەسیحیەکان لە رووی ژمارەوە پلەی دووەمن و ژمارەیان لە سێ ملیۆن کەمتر نیە لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەك ڕێژەکەیان کەم نیە بەریتانین و بەوویستی خۆیان ئیسلامیان هەڵبژاردووە.

ئیتر دەبێت چۆن بێت و چی رووبدات ئەگەر کەمینەی موسڵمان داوایەکی وەها نارەوا بکات و ڕێگە لە زۆرینەی فەرمانڕەوا بگرێت کە ئاینەکەی پەیرەو بکات چونکە کەمێك لە موسڵمانانیان لە نێوانیاندایە؟!

**ئەمانە داوا گەلێکی نارەوان پێشینەی نەبووە لە مێژوودا!**

کەمینەی نا موسڵمانان لە ژێر باڵی شەریعەتی ئیسلامدا بە درێژایی سیازدە سەدەی تەواو ژیانی بەسەر برد و شەریعەتی جێ بەجێ کرد نەگازاندەی هەبوو و نە بیری لێ دەکردەوە، بەڵکو بەهانەی نەبوو بۆ گازاندەو سکاڵا... هەتا موسڵمانان گەیشتنە نزمترین پلەی بێ دەسەلاتی و بێ تواناییان دواتر ئەم بانگەشانە هاتنە ئاراوە!

کەمینەی موسڵمان ئەم بانگەشەیە لە قاڵبێکی راشکاوانەدا ناخاتە روو بەهۆی سروشتی بارودۆخەکەوە- بەوەی رێگە لە زۆرینەی موسڵمان بگرێت لە پەیرەوکردنی ئاینەکەی- چونکە لە وولاتە ئیسلامیەکاندا جورئەتی لەم شێوەیە ناکات، هەر چەندە موسڵمانان لەوپەری لاوازی و بێ دەستەلاتیدا بن!

بەڵکو لە رووکەشی دەرەوەی داواکەیاندا تەنها لە کارخستنی جێ بەجێ کردنی شەریعەتەو با موسڵمانان هەر بە موسڵمانی بمێننەوە! چۆنیان پێ خۆشە پەیرەوی ئایینەکەیان بکەن!

لەوانەیە ئەو بانگەشەی لە دەروازەی یەکەمدا باسمان لێوە کرد ئێستا راستیەکەیمان لەلا ئاشکرا بێت، هەروەها رووی پشتەوەی پیلانەکەش ئاشکرا بوو!

لەو نمونانەی بە موسڵمانان وترا ئێوە هەر موسڵمانن ئەگەر شەریعەتی خوداش جێ بەجێ نەکرێت! چونکە ئێوە نوێژ دەکەن و رۆژوو دەگرن.. یان خۆ ئێوە دەڵێن(لا اله الا الله) ئیتر ئێوە موسڵمانن!!

**بزانە بەبێ شەریعەتی خودا ئەوە ئیسلام بوون نیە!**

ئەم مەسەلەیەمان لە دەروازەی یەکەمدا باس کردو، پێم وایە رووی

ڕاستەقینەی بابەتەکەمان ئاشکرا کرد و ئەوەندە بەسە کە خودا دەفەرموێت:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾[1].

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴾[2].

## بەبێ شەریعەتی خودا ئیسلام نیە!

ئاینێك تەنها بیروباوەڕ یان بیروباوەڕ لەگەڵ چەند شێوەیەکی پەرستن بێت و، بەبێ یاساو شەرع هەڵس و کەوتی خەڵکی سەر زەوی حوکم بکات ئاینێکی نەفامانە و ساختەیەو لە لای خوداوە نەهاتۆتە خوارەوە...

هیچ پەیامێکی ئاسمانی تەنها بیروباوەڕ نەبووە یان بیروباوەڕ و چەند شێوازێك لە پەرستن نەبووە بەبێ شەرع و یاسایەك هەڵس و کەوتی خەڵکەکەی سەر زەوی ڕێك بخات و بەڕێوەی ببات:

﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ وَلَا تَنقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ ۚ إِنِّي أَرَاكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَا قَوْمِ أَوْفُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾[3].

---

(١) سورەتی النساء(٦٥).

(٢) سورەتی النور(٤٧-٤٨).

(٣) سورەتی هود(٨٤-٨٥).

ئەو پەیامەی(شعیب)ی هاوهۆزیان بۆ (مەدین)ی هێنابوو، پەرستنی خودا بە تاك و تەنیاو ئەو شێوازانەی لە بیروباوەڕی هاتووە بۆ پەرستن بوو، هەروەها فەرمانی تێدایە کەوا بە ئارەزووی خۆیان مامەڵە بە سامان و سەروەتیانەوە نەکەن، بەڵکو پەیوەست بن بەو شەریعەت و یاسایەی لە خوداوە بۆیان هاتۆتە خوارەوە، ئەمە بوو گەلی شوعەیب لێی تێگەیشتن و، پاشان ڕەتیان کردەوە لەبەر بێ باوەڕی و نەفامیان خودا پاشتر لە ناوی بردن:

﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴾(١).

مانای: ئایا لە داواکاریەکانی ئەو ئایینەی تۆ بانگمان دەکەی بۆی ئەوەیە واز لە پەرستنی ئەو خودایانە بهێنین لەباو باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە، هەروەها لە مامەڵەکردنمان بە سامان و سەروەتمانەوە دەمانبەستێتەوەو تەنها بەپێی ئەو فەرمانانەی بۆت هێناوین نەبێ ناتوانین مامەڵەی پێوە بکەین؟! پاشان بە گاڵتە جارییەوە پێ یان ووت: ئەمەت لەکوێ بوو تێگەیشتووی هێمن کە بەم کۆت و بەندانە ئێمەی پێ پێبەست دەکەی؟!

لە دوای ووتنی ئەمەیان: مانای ڕەتکردنەوەی بیروباوەڕ و شەریعەتەکەیان دا چونکە بێ باوەڕ و هاوبەش بڕیاردەربوون:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ ﴾(٢).

لە سورەتی(الشعراء)دا تۆمارێکی یەك بە دوای یەکی پێغەمبەران(سەلامی

---

(١) سورەتی هود(٨٧).

(٢) سورەتی النحل(٣٥).

خوایان لەسەر بێ) دەبینین کەوا هەر یەکێکیان فەرمانی بە گەلەکەی کردووە خودا بپەرستێت و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەیان بن و پاشان هەر پێغەمبەرێك پەنجە دەخاتە سەر ئەو واقعە هەڵە و خواروخێچانەی لە هەڵس و کەوتی دنیایاندا تێ کەوتوون و، داوایان لێ دەکات بەپێی داواکاریەکانی باوەڕبوون بە خودا واتە بەپێ داواکاریەکانی شەریعەتی ئاسمانی کە لەلای خوداوە هاتۆتە خوارەوە ڕاستی بکەنەوە:

﴿كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾(١).

﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾(٢).

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ

---

(١) سورەتی الشعراء(١٢٣ — ١٣١).

(٢) سورەتی الشعراء(١٤١ — ١٥٢).

ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم
بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴾(١).

﴿ كَذَّبَ أَصْحَـٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ
أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ
ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ
﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾(٢).

**ئەگەر بێینە سەر باسی سێ پەیامەیەکی دوایی ئەوا باسێکی دووروودرێژی لە قورئان دا هەیە:**

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ
هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ
شُهَدَآءَ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا وَمَن لَّمْ
يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ
بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ
وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ
أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ
يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ

---

(١) سورەتی الشعراء(١٦٠ – ١٦٦).

(٢) سورەتی الشعراء(١٧٦ – ١٨٣).

وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ الْإِنجِيلِ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم
بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٤٧﴾ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا
بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ
أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ
لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ إِلَى اللَّهِ
مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ
اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا
فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ
الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾[1].

**نەخێر! هیچ ئایینێك نیە تەنها بیروباوەڕ بێت، یاخود بیروباوەڕ و چەند شێوازێك بێت لە خودا پەرستی و بەبێ شەریعەت و یاسا!**

**ئەم چەمك و تێگەیشتنە ڕۆژئاوایی یە(عیلمانی)یە بۆ ئایین کەوا پەیوەندیەکی تایبەتە لە نێو خوداو بەندەداو، شوێنەکەی تەنها دڵەو پەیوەندی بە واقعی ژیانەوە نیە.. لە چەمك و تێگەیشتنی کەنیسەی دەستکاری کراوەوە هاتووە کە دروشمی بریتی بوو لە (ئەوەی هی قەیسەرە بۆ قەیسەر و ئەوەی هی خودایە بۆ خودا). ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو واقیعەی نەسرانیەتی لە ماوەی سێ سەدەی یەکەمدا چەشتی لە دەربەدەری و ڕاوەدوونان و چەوساندنەوە لە لایەن ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی بت پەرستەوە کەهەلیان بۆ نەڕەخسا شەریعەت و یاساکە جێ بەجێ بکەن و، تەنها**

---

(١) سورەتی المائدة(٤٤ — ٥٠).

بەبیروباوەڕ و خودا پەرستی بەسەریانبرد و، بە ناچاری نەچووە قاڵبی کرداری جێ بەجێ کردنەوە ئەومیان بە ئایین دانا. پاشان کاتێك پاپاکان دەستەڵاتیان بەسەر پادشاو بەتریکەکاندا پەیدا کرد هەوڵی تەواوکردنی ئایینەکەیان نەداو ئایینەکە بە دەستکاری کراوی مایەوەو ڕۆڵی ئاینی ئاسمانی نەگێڕا کە لە لایەن خوداوە نێردرا بێت.

دواتر کە عەلمانیەت لەم سەردەمە نوێ یەدا هات ڕێگەکەی بۆ تەخت و والابوو، هەوڵ و ماندووبوونی پێویست نەبوو بۆ جیاکردنەوەی(ئایین) لە(دەوڵەت) و، جێگیرکردنی ئایین بەم شێوازە لاوازەی ئێستا ڕۆژئاوا پەنای بۆ بردووەو بەو شێوەی خودا لە بارەی ئەوانەی بەم شێوەیە پەیڕەوی دەکەن دەفەرموێت:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ ئەم سێ سیفەتە پاشکۆی هەر کەسێکە لە حوکمی شەریعەت لا دەدات و حوکم بە یاساکانی نەفامی و دەستکرد دەکات.

بەلام سەبارەت بەوانەی هەندێکی جێ بەجێ دەکەن و پشت لەوانی تر دەکەن خودا دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَاءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰ أَشَدِّ الْعَذَابِ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾(١).

ئەمە ئەو بارودۆخەیە کەوا کەمینەی ناموسڵمان لە هەموو زەوی دا بۆ

---

(١) سورەتی البقرة(٨٥).

موسڵمانانی دەخوازن یان دەیانەوێ هەندێ لە نێو ئوممەتی ئیسلامی دا وا لێ بکەن موسڵمانان بخەنە ئەم دۆخەوەو بەو بیانووەی ئێمە کەمینەی ناموسڵمانمان لە نێو جیهانی ئیسلامی دا هەیە.

ئای ئەمە ریسواییەکە(موسڵمانان)ی تێ کەوتووە دوایی ئەوەی ئایینەکەی خودایان بەکەم گرت؟! دروشمەکانی عیلمانیەتیان قبوڵ کردو ئایین بۆ خودا نیشتمان بۆ هەمووان لە کاتێکدا خودا دەفەرموێت

﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ ﴾(١).

و دەفەرموێت: ﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ ﴾(٢).

ئایین هەمووی(کلە) واتە بیروباوەڕ و هەڵس و کەوت و پەرستن و شەریعەت هەمووی وەك یەك بۆ خودایە!

وەك پێشتر باسمان کرد کەمینە ناموسڵمانەکانی لەژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامیدا ژیاون و شەریعەت لە ماوەی سیازدە سەدەی لەسەر یەك جێ بەجێ کراوە و، بەبێ سکاڵا یان بیرکردنەوە لە سکاڵا و نەبوونی بیانوو بۆ گازاندە و سکاڵا دا بەسەریان بردووە، چونکە ئەو لێ بووردەییەی لەم ئایینەدا بۆ کەمینەکانی تر فەراهەم هاتبوو لە هەموو سەر زەوی دا نەبینراوە، ئەگەر وویستت یەك کتێبی تەواو سەبارەت بەم لێبوردەییە بخوێنیتەوە لە وەسفی ئەم خاڵەدا بڕوانە کتێبی رۆژهەڵاتناسی مەسیحی(ت . و .ارنولد t.w.arnold) بەناونیشانی(الدعوة الى الاسلام the preaching of

(١) سورەتی الانعام(١٦٢ – ١٦٣).

(٢) سورەتی الانفال(٣٩).

islam)[١] لەوانە لە لاپەرە(٥١) تێیدا هاتووە دەڵێت: لەو نمونانەی پێشتر باسمان کرد سەبارەت بەو لێبوردەییەی موسڵمانە سەرکەوتووەکان ڕەخساندبوویان بۆ عەرەبە مەسیحیەکان لە سەدەی یەکەمی کۆچ دا و پاشان لە نەوەکانی دواتریان دا بەردەوام بوو دەتوانین بگەینە ئەو دەرئەنجامە سەبارەت بەم هۆزە مەسیحیانەی موسڵمان بوون ئەمانە بە وویست و هەڵبژاردەی خۆیان بووەو ئازاد بوون و ئەو عەرەبە مەسیحیانەی لەم رۆژگارەی ئێستادا لە نێو کۆمەڵگای موسڵماندا دەژین هەمان لێبوردەیی دەبینن).

خودا ئەم ئوممەتەی زۆر بە پتەوو بەتینی دامەزراندووە تاوەکو فەرمانڕەوایی پانتاییەکی زۆر لەسەر زەوی بکات و لە نێوانیدا کەمینەی ناموسڵمان دەبێت، خودا خۆی زانایە بەوەی ژێر دەستەو ئەوانەی دەوڵەتی ئیسلامی فەرمانڕەوایی دەکات تێدا دەبێت.

ئوممەتە پێشینەکان کاتێك پێغەمبەرێك هاتووە بۆیان و باوەڕیان پێ هێناوە، باوەڕیان بەوەی دواتری نەهێناوە و ڕق و کینەیان بەرانبەر ئەو کەسانە هەبووە کە کەوتوونەتە شوێن پێغەمبەری نوێ ئەگەرچی لە خزمە نزیکەکانی خۆشیان بووبێت و، چەوساندونیانەتەوەو دەریان کردوون تەنها لەبەر جیاوازی لەبیرو باوەڕدا.

بەڵام ئەم ئوممەتە خودا وای بۆ داناوە پێغەمبەرەکەی کۆتایی پێغەمبەران بێت(صلى الله عليه وسلم) نەنێردراو نە پێغەمبەر بە دواییدا نەیەت، هیچ رق و گەرد لە دڵیاندا بەرانبەر کەس دروست نابێت، نەبۆ پێشینەکان چونکە

---

(١) وەرگێرانی دکتۆر(حسن ابراهيم حسن) و هاورێکەی لە قاهیرە چاپکراوە.

پێغەمبەرەکەیان گەورەی مرۆڤایەتی و گەورەی پێغەمبەرانەو کەس بەدواییدا نایەت و ئوممەتێکی دی لە دوایەوە دروست نابێت، پاشان باوەڕبوون بە پێغەمبەرانی پێشووی کردووە بە بەشێك لە بیروباوەڕەکەی، نەوەك وەك ئەوانی تر تاوەکو شوێن کەوتووەکانی راو بنێت و بیانچەوسێنێتەوە بەهۆی جیاوازی بیروباوەڕەوە ستەمیان لێ بکات:

﴿ الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ۝٣ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ۝٤ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾[1].

هەروەها ئوممەتی موسڵمانی ئامۆژگاری کردووە لەگەڵ خاوەن کتێبە ئاسمانیەکاندا دادوەرانە بن و عادیلانە بن لەگەڵیان داو پەیوەندی رێك و جوان لە نێوانیاندا هەبێت:

﴿ فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ ﴾[2].

﴿ ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ

---

(١) سورەتی البقرة(١ — ٥).

(٢) سورەتی الشوری(١٥).

أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيَ أَخْدَانٍ ﴾[١].

هەروەها ئوممەتی موسڵمانی کردۆتە لێپرسراوی پاراستنی کەنیسەو پەرستگاکانیان و، ڕەخساندنی هەل جێ بەجێ کردنی پەرستنەکانیان تێیدا، هەروەها وازی لێ هێناون لەبواری یاسای باری کەسێتیان بەپێی شەریعەتەکەی خۆیان بەسەریاندا جێ بەجێ بکرێت.

خۆشترین ژیان لەژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامدا ژیان کە کەمینەکانی تر خەونی پێوە دەبینن، لە کۆندا خەڵکی شام بەئەبی عوبیدەی جەڕڕاحیان ووت: ( ئێوە ئەگەرچی لەسەر ئایینەکەمان نین زۆر لەوانەی لەسەر ئایینەکەی خۆمانن ئێوە بۆمان بە بەزەیی ترن)[٢].

لە کاتێکدا ئەوروپا جولەکەی ڕاودەنا لەسەدەکانی ناوەڕاست و بە دوایانەوە بوون گوایە ئەوان(مەسیح)یان -سەلامی خوای لێ بێ- لە خاچ داوە، هیچ پەناگەو شوێنێك نەبوو دالدەیان بدات تەنها سنگی فراوانی دەوڵەتی ئیسلامی نەبێت لە ئەندەلوس، کاتێك پاش قەسابخانە دڕندانەکانی دادگای پشکنین بەرانبەریان کردیان دیسان جولەکە کۆچیان کرد لە گەڵیاندا بۆ مەغریب تاوەکو ژیانێکی خۆشگوزەرانیان هەبێ لەژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامی لەوێ.

هەر چۆن کەمینەی جۆراو جۆر لەژێر سێبەری دەوڵەتی عوسمانی دا بۆ ماوەی چوار سەدە بە دڵنیایی و پارێزراوی ژیان و، هەموو چالاکیەکانی خۆیان بەبێ هیچ تانەو تەشەرێك جێ بەجێ دەکرد، هەتا دواتر روسیاو فەرەنساو

---

(١) سورەتی المائدة(٥).

(٢) بڕوانە(الدعوة الى الاسلام) پێشتر ئامازەمان پێ کرد لاپەرە ٥٤.

بەریتانیا هاتن و کەمینەکانیان لە دژی دەوڵەت هان دا تاوەکو لە ناوەوە تێکی بدەن و بیشێوێنن.

ئەم ژیانە هێمن و ئارامە بۆ کەمە نەتەوایەتیەکان لەژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامی دا بەراورد بکە بە بارودۆخی زۆرینەی چەوساوەو داماو لە حەبەشە، بێجگە لە حاڵی کەمینەی موسڵمان لە هند و لە فلیپین و جگە لەوە لە شوێنەکانی تری سەر زەوی.

دوای ئەمە ماڤ ئەو کەسانەیە بڵێن ڕەوایە کەمینەی ناموسڵمان ڕێگە لە زۆرینەی موسڵمان بگرێت ئایینەکەیان پەیڕەو بکەن بەو بەو شێوەیەی خودا داوایان لێ دەکات؟!

چ نەهامەتی و نەگبەتیەکە بەسەر(موسڵمانان)دا هاتووە وای لێ کردوون کۆمەڵێك تاکی وایان تێدا بێت ناوی موسڵمان هەڵدەگرن و، پاشان داوا دەکەن شەریعەتی خودا جێ بەجێ نەکرێت لەبەر خاتری بوونی کەمینەی ناموسڵمان، وەك ئەوەی بڵێن ئەی موسڵمانینە بێباوەڕ بن بە ئاینەکەتان و وازی لێ بێنن بۆ ئەوەی کەمینەی ناموسڵمان بە تەواوی بتوانێت ئایینەکەی خۆی جێ بەجێ بکات!!

## دەروازەی شەشەم

# "گومانی بەهۆی دەوڵەتە گەورەکان و زلهێزەکان و فشارەکانیان لەسەر دەوڵەتی ئیسلامیی ناتوانرێ شەریعەت جێ بەجێ بکرێت":

وا دیارە ئەم گومان و دوو دڵییەیان لە هەموو گومانەکانی تر زیاتر واقعی یە... ئەو دەوڵەتانەی بەهۆی پەلاماری سەربازی دوژمنانی ئیسلامەوە شەریعەتی تێدا کەنار خراوەو وەلانراوە لەسەر حوکم هەتا ئێستاش دەستەڵاتی ڕاستەقینەیان لەسەر کارو بەڕێوەبردنەکانیان نیە، ئەگەرچی لە رووکەشدا سەربەخۆییان بە دەست هێناوە، بەو واتایەی سوپای داگیرکەر لەسەر خاکەکەی نەماوە بەڵام هێشتا لەژێر دەستەڵاتی سیاسی و ئابووری ئەو دەوڵەتانە یاخود هێزی جیهانیانە دایە کە بە(دەوڵەتە زلهێزەکان) ناو دەبرێت لە بارودۆخێکی لاوازی سیاسی و ئابوری و سەربازی و زانستی و ماددی وا دایە ملکەچ بوونی بۆ دەستەڵاتی ئەو هێزانە بۆتە واقعێکی ناچاری بیەوێت یاخود نەیەوێت.

**بۆ ئەم مەسەلەیە لەم توێژەوەیەماندا دوو لایەنی هەیە:**

لایەنی یەکەم وەڵامی ئەم پرسیارەیە: بۆچی جیهانی ئیسلامی گەیشت بەم بارودۆخە پڕ شکست و ریسواییە لەبەرانبەر هێزە جیهانیە داگیرکەرەکاندا؟

لایەنی دووەم وەڵامی ئەم پرسیارەیە: ئایا بەراستی هیچمان لە دەست نایەت بەرانبەر دەستەڵاتی جیهانی بەسەر ئوممەتی ئیسلامیدا؟

ئەگەر ئەم دوو لایەنە روون بکەینەوە واقیعیەتی راستەقینەی ئەم گومانە لەگەڵ گومانەکانی تردا دەردەکەوێت.

سەبارەت بە پرسیاری یەکەم نامانەوێ لێرەدا درێژەی پێ بدەین[١] بەڵکو وەڵامەکەی زۆر بە پوختی کورت دەکەینەوەو، ئەو شکست خواردنەی ئێستا تێی کەوتووین بە هۆی پشت گوێ خستنی پلە بە پلەی بەردەواممان بووەو، دەست بەردانە لە ئایینەکەمان و تەماشا نەکردنی چەمکەکانی بەو شێوەو مانایەی هاتۆتە خوارەوە پێی و، هێنانەکایەی شێوەی نامۆ لەم ئایینە هەر لە تێگەیشتن لە(لا اله الا الله) و چەمکی بۆپەرستن و قەزاو قەدەرو دونیاو دوارۆژ، تا دەگاتەوە چەمکی شارستانیەت و ئاوەدانکردنەوەی زەوی و، بۆ تێکۆشان و پەروەردەو ئاکارو رەوشت و چەمکی زانست تا دەگاتەوە بە چەمك و تێگەیشتنی هەموو شتێك لەم ئایینەدا[٢].

لەکاتێکدا پێشتر(لا اله الا الله) پرۆگرامێکی تێرو تەسەلی ژیان بوو، بوو بە ووشەیەك تەنها بە زمان بوترێت!

پەرستنەکان کورت کرانەوە لە چەند شێوازێکی خوداپەرستیدا، لە کاتێکدا پێشتر گشتگیربوون بۆ هەموو کارو بیرکردنەوەو هەستەکانی ژیانی موسڵمانی باوەڕدار!

بیروباوەڕی قەزاو قەدەر هێزێکی پاڵنەرو ووزەبەخش بوو ورەی بەرز دەکردەوە بەڵام گۆڕا بەهێزێك لاوازیو کۆسپ و تەگەرە دروست بکات!

دنیاو دوا رۆژ لە لای موسڵمان یەك شت و یەك ڕێگا بوون، سەرەتا لە دنیاوە دەستی پێ دەکرد و کۆتاییەکەی بە دوا رۆژی دەگەیاند، بەڵام ئەمڕۆ بوو بە دوو بەرەی دژ بە یەك؛ یان کار بۆ دنیا بکە یاخود کار بۆ دوا رۆژ... ناکرێت پێکەوە ببسترێتەوە!

---

(١) ئەگەر وویستت بڕوانە(واقعنا المعاصر) بەشی(اثار الانحراف)

(٢) ئەگەر وویستت بڕوانە کتێبی (مفاهیم ینبغي ان تصحح).

شارستانیەت چەمك و تێگەیشتنێکی گشتگیر بوو، بیروباوەڕو بەها و ئاکارو ڕێکخستنەکان و یاساکان و بیرۆکەکان و چالاکیەکان بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی دەگرتەوە، بوو بە چەمکێکی سەر زارەکی ماددی لە هەموو ئەو بەها ڕاستەقینانەی ژیانی مرۆڤی موسڵمانی پێ جیا دەکرایەوە داماڵدرا!

تێکۆشان و جیهاد بزوتنەوەیەکی بنیاتنەر بوو بۆ لابردنی نەفامی لەسەر زەوی و دانانی پرۆگرامی پەروەردگار لە شوێنی و چەسپاندنی ئاینی خودا لەسەر زەوی، دواتر چڕکرایەوە لە(بەرگری کردن)، پاشان لای سۆفیەکان بوونی لاوازتر بوو تەنها بووە جیهادی دەروونی کەسەکە خۆی و وازهێنان لە هەموو ئەوخراپەیەی زەوی داپۆشیوە!

پەروەردە پەروەردەیەکی گشتگیر بوو، ئامانجی بنیاتنانی موسڵمانێکی باوەڕداری زانا بە ئاینەکەی و ڕازاوە بە ڕەوشتەکانی و تێکۆشەر لە پێناویدا بوو، بەڵام ئەمڕۆ پەروەردە بووە بە شتێکی چاو لێ کەری، کەسایەتیەکی خراپ و هەرزەی لێ دەردەچێت، هیچ رۆڵێکی باشیان نی یەو تواناى بنیات نانیان نی یەو ناتوانن ڕووبەڕوی ئەو شتە نوێ یانە ببنەوە کە لە ژیاندا پەیدا بووە.

ڕەوشت و ئاکار مانایەکی گشتگیری هەبوو، مەبەست لێی ڕەوشتی سیاسی و ئابوری و هەڵس و کەوتە کۆمەڵایەتیەکان و ڕەوشتی بیرو ئەدەب و ڕەوشتەکانی خێزان و سێکس و ... دەگرێتەوە، بەڵام دواتر لە چەند جۆرە هەڵس و کەوتێکدا تەسك کرایەوەو بووە چەند داب و نەریتێکی بێ رۆح!

زانست هەموو زانستە ئاینی و دنیاییەکانی دەگرتەوە لە پزیشکی و فەلەکناسی و بیرکاری و فیزیا و کیمیا... هتد، پاشتر تەنها زانستی ئاینی سنوردار کرا لە چەند مەزهەبێکی تەسك و دەمارگیری نەخۆش و دەردەداردا کۆکرایەوە کە هەمووی تەنها چاو لێکەری فیکری بوون و داهێنانی تێدا نەبوو.

دوایی هەموو ئەم ڕووداوانە دوا کەوتنی زانستی و ماددی و شارستانی و سیاسی و سەربازی و ئابووری و ڕەوشتی بە دوایی خۆیدا هێنا، دوژمنانی لە هەموو لایەکەوە ڕاکێشا تاوەکو دەست بگرن بەسەر ئیسلامداو هەوڵی لەناوبردنی بدەن!

(يوشك أن تداعى عليكم الامم كما تداعى الاكلة الى قصعتها قالو: امن قله نحن يومئذ يا رسول الله.؟ قال: انكم يومئذ كثير ولكنكم غثاء كغثاء السيل ولينزعن الله المهابة من صدور اعدائكم و ليقذفن في قلوبكم الوهن. قالوا: وما الوهن يا رسول الله؟ قال: حب الدنيا وكراهية الموت) [١].

واتە:( لەوانەیە کاتێك بێت میللەتان سەرتان تێ دەکەن، چۆن خۆرە(الاكلة) سەردەکاتە خۆراکەکەی، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لەو ڕۆژگارەدا لەبەر کەمی وامان بەسەر دێ؟ فەرمووی: ئێوە لەو کاتەدا ژمارەتان زۆرە، بەڵام ئەوەندە لاوازن وەك بڵقی سەر ئاو وان، خودا هەیبەت و قورساییتان لە دڵی دوژمنەکانتان هەڵ دەگرێت و، دڵی ئێوەش پڕ دەبێت لە(وهن)، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ! (وهن) چی یە ؟ فەرمووی: خۆشەویستی دونیا و ترس لە مردن).

لاوازی و بێ دەستەڵاتی موسڵمانان لەم ڕۆژگارەدا..ڕاستیە، بەڵام ڕاستیەکە تاوانەکەی لەسەر ملی موسڵمانان خۆیانەو، نابێت بە بەهانەو بیانوو بۆ هەموو ئوممەت لە ڕۆژی قیامەت دا کە خودا دەربارەی ئەو ڕۆژە دەفەرموێت:

﴿ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴾[٢].

موسڵمانان دەڵێن - ڕاستیش دەکەن - فێڵ و پیلانی دوژمنان زۆر بەهێزو

---

(١) أخرجه احمد وابوداود.

(٢) سورەتی القيامة(١٤ — ١٥).

توندو تیژە.

بەڵام دەبێت بزانین ئەم پیلان و هێزە کوڕی ئەمرۆ نیە و کوڕی دوێنێی نزیکیش نیە... تەمەنی بە شێوەیەکی دیاری کراو دەگەڕێتەوە بۆ چواردە سەدە و زیاتر پێش ئێستا، واتە لەو کاتەی ئەم ئایینە هاتۆتە خوارەوە، گەر بگەڕێینەوە سەر قورئان دەبینین وەسفێکی ووردی ئەم فێڵ و پیلانانەی لە هەموو لایەنە داخ لە دڵەکانیانەوە بۆ سەر(لا اله الا الله) دەدۆزینەوە و، هەر ئوممەتێك(لا اله الا الله)ی کردبێتە واقیعێکی کرداری ژیانی لەسەر زەوی دا هەڵوێستی دژایەتی کردنی جولەکەو مەسیحی و دووڕوەکان و هاوبەش پەیدا کەرەکان نەگۆڕ بووە لەو چواردە سەدەیەدا ئەگەرچی هۆکارەکانیان جیاواز بووبێت کە گەیاندوونی بەو هەڵوێستەیان:

﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ﴾(١).

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟﴾(٢).

﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ﴾(٣).

نەخێر! ئەم فێڵ و پیلانانە کوڕی ئەمرۆ و دوێنێی نزیك نیە... بەڵکو مێژووەکەی زۆر زۆر کۆنە، ئەگەرچی هەندێ لە هۆکارەکان گۆڕانکاری بەسەردا

---

(١) سورەتی البقرة(١٢٠).

(٢) سورەتی البقرة(٢١٧).

(٣) سورەتی البقرة(١٠٩).

هاتبێت، چونکە هەموو نەوەیەك لە ململانێکانیدا ئەو ئامرازانە بەکار دەهێنێت کە لەبەر دەستی دان و بۆی هەڵدەکەوێت.. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی گۆڕاوە هەڵوێستی ئوممەتی ئیسلامی خۆیەتی بەرانبەر ئەم فێڵ و پیلان و هێزانە، خودی پیلان و هۆکارەکان نەگۆڕاون.

خودا لە قورئان دا ئوممەت ئاگادار دەکاتەوە لە دوژمنەکانی و، هەڵوێستیان و، هۆکارەکانیان و، تەگبیرو فێڵە ئاشکراو نهێنی یەکانیان، پاشان لە کۆتاییدا رووردەکاتە موسڵمانان و پێیان دەفەرموێت: ﴿وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔا﴾[1].

## کەواتە ئەمە مەسەلەکەیە...

ئەوان دەست لە فێڵ و پیلان هەڵناگرن هەتا هەتایە تاوەکو ئوممەتی موسڵمان بوونی هەبێت، لە هەر کوێ یەك ئەو هەلەیان بۆ بڕەخسێت لە ناوی ببەنو بگەڕێتەوە... بەڵام خودا هۆکاری پەروەردگارانەو چارەسەری بۆ گەڕانەوەی پیلانەکانیان و وای لێ بکات بەرۆکی خۆیان بگرێتەوەو هیچ زیان بە ئوممەتی ئیسلام نەگات داناوە:

﴿وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ﴾[2].

ئەو هۆکارو ئامرازە خوداییە چی یە پیلان و فێڵەکانیان دەگەڕێنێتەوەو دەیداتەوە بەروویانداو، ئەوان تەنها ماندووبون و شەکەتییان بۆ دەمێنێتەوە؟

---

(١) سورەتی ال عمران(١٢٠).

(٢) سورەتی ال عمران(١٢٠).

ئایا دوعایەکە دەیخوێنیت و وەك جادوو دەیڵێی، یاخود نوشتەیەکەو بە سنگەوە دەکرێت؟ نەخێر! ئەوە کاری چاکەو مەزنەو لە دوو ووشەدا کورتی کردۆتەوەو خستویەتیەروو: ئارام بگرن(تَصۡبِرُواْ)... خودا پەرستی بکەن و پارێزگار بن(وَتَتَّقُواْ ).

کاتێك موسڵمانان لە هەموو چەمك و تێگەیشتنەکانی ئیسلام لایاندا بەهەمان شێوە چەمکی ئارامگرتن و تەقواو خودا پەرستی لە لایان گۆڕا، بەرەو خراپەکاری رۆیشتن و هیچ سوودێکیان نەما.

با بچینەوە سەر دەقی ئایەتەکان تاوەکو لە مەبەستی ئەم دوو ووشە مەزنە تێبگەین، دوژمنان دەیانەوێت موسڵمانان لە ئایینەکەیان دابڕن و، پاشان دواتر بیانگەڕێننەوە بۆ سەر بێ باوەڕی.. کەواتە ئارام گرتنی داوا کراو لێرەدا چی یە؟

ئەوە ئارام گرتنە لەسەر داواکاریەکانی ئەم ئایینەو... ئارام گرتنە لە رووبەڕووبونەوەی دوژمناندا، دامەزراوەیی موسڵمانانە لەسەر ئایینەکەیان با دوژمنان هەر چیەك بکەن بۆ جیاکردنەوەی لە ئایینەکەی.

ئەی تەقوا چی یە؟ پەرستنی خودایە، واتە خۆپاراستن لە رق و تورەیی خودا، کەواتە بەچی لە تورەیی و خەشمی خودا خۆت دەپارێزیت؟ ئایا تاکە رێگا گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی و نەکردنی قەدەغە لێ کراوەکانی نی یە؟!

ئەمە ئارامگرتن و ئەوەش تەقوا کەوا دژی پیلان و فێڵەکانی دەوەستن وەك قەڵغان و زیان ناگەیەنێت، وەك دەبینین دوو هێزی چاك و سەرسورهێنەرن، پتەو وەك قەڵاو دوژمن هیچ کون و قوژبن و کەلێنێك نادۆزێتەوە تا دەستی بگات بەم ئوممەتەو زیانی پێ بگەیەنێ.

لێرەدا مەبەست زیان گەیاندن نیە بەتاکەکان بەڵکو زیان گەیاندنە بە

ئایینەکە کە کۆڵەکەی ئەم ئوممەتەو بوونی راستەقینەیەتی، بەڵام زیان و قوربانی لێ دەکەوێتەوە بەڵام کار ناکاتە سەر بوونی ئوممەت و لە رێگە لای نادات:

﴿ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ۖ وَإِن يُقَـٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴾[١].

هەروەها بارودۆخی موسڵمانان و ئەم ئوممەتە وا بووە، ئەو کاتەی باڵادەست بووەو فەرمانڕەوا بوو بەم مەرجە... دەستەڵاتی چەسپاو بوو لەسەر زەوی و باڵادەست و سەربڵند، پیلانی دوژمنان دەگەڕایەوەو بەرەو رووی خۆیان وەك چۆن لە کاتی شەڕی خاچ پەرستەکانی یەکەمدا[٢] روی داورۆژگاری شەڕەکانی تەتەرو ئەوان... ئەوان لە دوژمنان.

کەواتە ئەگەر بڵێین پیلانەکەیان بەهێزە، ئەمە ڕاستەقینەیە بەڵام ئەم ڕاستیە موسڵمانان نابەخشێت لەو بەرپرسیاریەتیەی لەسەریانە لەبەردەم خودا دا لەرۆژێکدا مرۆڤ بەرچاو روونەو ئەگەر بەهانەو بیانووش بهێنێتەوە وەرناگیرێت و سوودی نیە.

لایەنی یەکەمی مەسەلەکەمان دایە بەر ڕۆشنایی... زانینی زۆر پێویست بوو بۆمان تاوەکو ڕێگەی ڕزگاری بدۆزینەوە چونکە پزیشك هەتاوەکو دەردەکە بە تەواوەتی دەست نیشان نەکات لەگەڵ ئەو هۆکارانەی بوونەتە هۆی ، دەرمانی تەواو کە ببێتە هۆی چاکبوونەوە بە ویستی خودا بۆی دیاری ناکرێت.

بەڵام لایەنی دووەم وەڵامی ئەم پرسیارەیە: ئایا هەر بەڕاستی هیچیان لە

---

(١) سورەتی ال عمران(١١١).

(٢) جیا لەشەڕی دووەمی خاچ پەرستەکان کە ماوەی دوو سەدە یان سێ سەدە هەر بەردەوامە تا ئێستاش بەردەوامی هەیە.

تواناداا نیە بەرانبەر پیلان و فێڵی دوژمنان؟!

کەسێك هەوڵ و کۆشش بدات ئەم قسەیە ناکات، ئەگەر چی پلەی کۆشش و تێروانینەکان و پرۆگرامی ئەوانەی کار دەکەن جیاوازە.

لە ڕاستیدا ئێمە زۆرمان لە توانادایە... ئەگەر عەزم و هیمەتی ڕاستەقینەمان هەبێت و ئاڕاستەیەکی ڕاست بگرینەبەر. واتە ئەگەر وویستمان هەبێت و بڕیارێکی ڕاستەقینە بدەین بگەڕێینەوە سەر ڕاستی ئایینەکەمان و داواکاریەکانی جێ بەجێ بکەین کەواتە دەبێت تێبکۆشین...

جگە لەمە هیچ ڕێگایەکی تر ناگات بە هیچ شتێك.. ئەوانەی تۆقیوون و ترساون شتی تر لە بری دادەنێن و وای بۆ دەچن دەیانگەیەنێتە ڕێگای ڕزگار بوون و لەهەمان کاتدا پێیان وایە لە تێکۆشان دەبەخشرێن.

دوای شیکردنەوەی واقعیانە دەردەکەوێت ئەم خستنەبریانە ئەندێشە و خەیاڵن، ئەوان دەڵێن: ئابوریمان لەسەر چەند بنچینەیەکی پتەو بنیات دەنێین چونکە هەموو شتێك لە جیهاندا لەسەر ئابوری و دارایی ڕادەوستێت.

دەڵێین: سڵاو لە بنیاننانی ئابوری و داراییمان لەسەر بنچینەی پتەو ئەمە کارێکە لە هیچ بارودۆخێکدا ناتوانرێ پشت گوێ بخرێت.

بەڵام هەڵەو خەیاڵەکە لەوەدایە وا بزانین ئەوە تاکە ڕێگایە بمانگەیەنێت و لە تێکۆشان دەمانبورێت. ئەوانەی ڕێگریمان دەکەن شەریعەتەکەمان جێ بەجێ بکەین هەر خۆیانن دەست دەخەنە بواری داراییمانەوە تاوەکو وای لێ بکەن پشت بە ئەوان ببەستین و نەتوانین سەربەخۆ بین و دەستیان لێ بەربدەین و، وامان لێ بێت نەگاتە ڕادەی گوزەراندن.

ئەمەش بانگەشە نیە بۆ نائومێدی بوون لە چاکسازی... نەخێر! بەڵام تەنها بەرچاو روونیەکە کەوا کارەکە پێویستی بەخۆبەخت کردن و تێکۆشانە.

ئەو زەوییانەی کەوا ئیسلام تێدا بڵاوبۆتەوە -بە قەدەری خودایی- بە فەزڵی خودا دەوڵەمەندترین پارچەکانی سەر زەویین بە سامانە مرۆیی و کانزایی و ئاویەکانی و، هەموو جۆرەکانی ووزە بەڵام خەڵکەکەی هەژارترین دانیشتوانی زەویین و برسی ترین و نەخۆشترین و دواکەوتووترین کەسن... ئەگەر ئەم سامان و ووزانە موڵکی ڕاستەقینەی خەڵکەکە بوایە ئەوا دەوڵەمەندترین دانیشتوانی زەوی دەبوون... چی ڕێگرە خاوەنداری بن و مامەڵەی ئازادی پێوە بکەن؟ هەر ئەو دوژمنانەن کەوا ڕێگەیان لێ دەگرن شەریعەتەکەیان جێ بەجێ بکەن!

بەس سۆدان بە تەنها ئەوەندەی زەوی و زار هەیە پسپۆران دەڵێن ئەگەر بە گەنم بچێنرێت بەشی هەموو ئەفریقیا دەکات و بە فەزڵی خودا کێشەی برسێتی لە رەگەوە هەڵدەکێشێت. چیرۆکەکەی ئەوەیە بە پیتترین پارچەی زەوی یە لە زەویەکان بەڵام لەم کاتەی ئێستادا چەند زۆنگاوێکەو بێ کەڵك دەردەکەوێت، هۆکارەکەی ئەوەیە لە یەك کاتدا نیل دوو لافاو هەڵدەستێنێت، یەکێکیان بەهۆی بارانە ناوخۆییەکانی سۆدان کە رووبار پڕ دەکات لە ئاو، پاشان لافاوی دووەم لە حەبەشەوە دێت و لم و لیتەی زەوی بە پیت دەکات لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت، لێرەدا رووبارەکە سەر ڕێژ دەکات و دەڕواتە سەر هەر دوو لاکەی زەوییەکانو دەیکاتە زەلکاوی بۆگەن، پرۆژەکە ئەوەیە نۆکەندێك هەڵبکەندرێت و گەنجینەی گلدانەوە بۆ ئەو ئاوە هاتوانەی حەبەشە دروست بکرێت، هەتاوەکو دەست بگیرێت بەسەر ئاوەکەی لە ئەنجامی باران بارین کۆبۆتەوە لە یەك کاتدا سوود لەهەردوو ئاوەکە و وەردەگیرێت و زەوی لە کاتی کەم ئاوی دا سوودی لێ دەبینێت و ئامادە دەکرێت بۆ کشتوکاڵ ئەوەندە گەنمی لێ دەچێنرێت بەشی هەموو ئەفریقیا بکات.

بەڵام چی وا دەکات ئەم پرۆژە بەرهەمدارو زیندووە جێ بەجێ نەکرێت(لە

کاتێکدا نزیکەی زیاتر لە نیو سەدەیە لە رووی هونەری یەوە دیراسە کراوە)؟ زۆر هۆکار رێگری جێ بەجێ کردنیەتی، ئەوە کەم نیە زلهێزەکان دەستیان بەسەر ئابوری و داراییمان دا گرتووەو هیچ کاتێك ناتوانن پارەیەکی زۆر تەرخان بکەین بۆ ئەم پرۆژە بە سوودەو کات نیە بۆ چاوەرێکردنی بەرهەمەکەی(هەر دەبێت چەند ساڵێك خەرجی لێ بکرێت تا دێتە بەرهەم) چونکە هەمیشە بە دوای ئەو هێزانەدا رادەکەین و چاوەڕێی بەزەییان لێ دەکەین پارەوە نانێکمان بۆ فرێ بدەن و، لیستی قەرزمان بۆ ئامادە بکەن و بیدەن بە سەرماندا، لەبەر بە ئەمەکەیان بۆ ئەو پارەوە نانەی دەیدات بە جەماوەرە برسیەکەمان پاشان چۆن و چۆنتر دەڕوات تەنها خودا دەیزانێ و باری جەماوەر قورس دەکرێت بە دانەوەی سووی ئەو قەرزانە!!

لە ئاسیادا ناوچەی دووری زۆری تێدایە گونجاوە بۆ کشتوکاڵ و، لەولاوە ئاوێکی زۆر بەبێ هودە دەچێتەوە زەریاکان یان لافاوی کوژەر دروست دەکات و کێڵگەو خەڵك دەکات بە ژێرەوەو لە ناویان دەبات... پێویستی بە پرۆژەی ئەندازیاری هەیە تاوەکو بەکارهێنانیان رێك بخات و گلی بداتەوە لە کاتی لافاوەکەدا پاشتر بۆ کشتوکاڵ و کارەبا سوودی لێ ببینێتەوە، چی رێگرە لەبەردەم ئەم پرۆژانەدا؟ هەمان هۆکارەکانی پێشوو ئەو هێزە دەستەلاَتدارەی نایەوێ موسڵمانان لەو شکستە هەستێتەوە.

ئیتر چۆن بەبێ تێکۆشان رووبەڕووی ئەم هێزانە دەبینەوە، دەڵێین: خۆمان پڕ چەك دەکەین تا بەرەنگاری ئەم دوژمنانە ببینەوە؟! دەڵێین: سلاَو و دەست خۆشی لە خۆ پر چەك کردنتان... لە هیچ بارودۆخێکدا ناتوانرێ وازی لێ بهێنرێت.

بەلاَم گومانێکی دی دیسان دێتەوە ئەویش ئەوەیە رێگاکە خۆی دەگات و بەبێ تێکۆشان.

## ئەی لە کوێوە چەکمان بۆ بێت؟

ئایا لە لایەن ئەو هێزانەوە کە رێگری جێ بەجێ کردنی شەریعەتمان لێ دەکەن و لە هەمان کاتدا لەو هێزە ڕاستەقینەمان بێ بەش دەکەن کە دەتوانین خۆمانی پێ بپارێزین، ئەمە جگە لەوەی هێزێکمان بۆ دروست دەبێت دوژمن دەتوقێنێ وەك خودا فەرمانمان پێ دەکات:﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡ ﴾[1].

کاتێك بمانەوێت هۆکارەکانی هێز بەدەست بێنین هێزە دەستەڵاتدارەکان هەڕەشەمان لێ دەکەن و دەدەن بەسەرماندا. ئەوە بە بیردەهێنینەوە کەوا(زلهێزەکان) ڕێگەی دا بە ئیسرائیل بەچەکی ناوەکی لە یەکێك لە دەوڵەتە عەرەبیەکان بدات چونکە هەڕەشەیە بۆ سەر ئاسایشی ئیسرائیل، لە کاتێك دا ئیسرائیل سێ کارلێك کردنی ناوەکی هەیە- بە پاراستنی لە لایەن زلهێزەکانەوە- هەڕەشەن بۆ هەموو جیهانی عەرەبی و بەتایبەت جیهانی ئیسلامی!

هەروەها لەبیرمان نەچێت ئەمریکا هەڕەشەی لێدانی لیبیای کرد بەو بیانووەی هەوڵی دروست کردنی کارگەی چەکی کیمیاویان داوە! لەکاتێکدا هەموو دەوڵەتە رۆژئاواییەکان کارگەی هەموو جۆرە چەکێکیان هەیە لە نێوانیاندا چەکی کیمیاوی کە لەسەر لیبیا قەدەغەیە هەیبێت!

(زلهێزەکان) لە خۆیان تەریق نابنەوەو شەرم دایانناگرێت، کە ئەم کارانەیان لێ ئاشکرا دەبێت، چونکە(گەورەن)و خاوەنی هێزن. پێشتریش بەریتانیای زلهێز ڕێگەی بەخۆی دا میسر داگیر بکات لە ساڵی ١٨٨٢ زاینی، بەو بیانووەی

---

(١) سورەتی الانفال(٦٠).

قەلا کۆنەکانی ئەبی قیری لەسەر کەناراوەکان نۆژەن کردۆتەوە!! تەنها نۆژەن کردنەوەی قەلای کردە بیانوو بە کارێکی دوژمنکارانە دای لە قەڵەم و! کارێك پێویست بوو تەمبێ بکرێت لەسەری!.

ئایا هیچ ڕێگایەکی ترمان هەیە بۆ لابردنی ئەم ستەم و چەوساندنەوەی لە هەموو بوارەکاندا یەخەی ئوممەتی ئیسلامی گرتووە تەنها تێکۆشان نەبێت؟!

دەڵێین: زانست وەردەگرین.

دەڵێین: بەسەرچاو بۆ زانست خۆ هەر بۆ خۆی ناگرێت لە هیچ بارودۆخێکدا وازی لێ بهێندرێت.

بەلام منداڵەکانمان ئەمڕۆ فێر دەبن بەلام بەبێ رۆحی تێکۆشان و تەنها توێکڵی زانست فێر دەبن و خۆ راگر و ئارام نین لەبەردەم داواکاریەکانی زانستی ڕاستەقینەدا و، فێر دەبن تەنها لەبەر ئەوەی شەهادەیەك بەناو بەدەست بهێنێت و پیشەیەکی حەساوە بەدەست بهێنن و، لەو کارانەی ماندووبوونی تێدایەو وولاتی پێ پێش دەکەوێت ڕادەکەن. هەر کاتێك یەکێکیان تێدا هەڵبکەوێت لە زانستەکەیدا ناوبانگ پەیدا بکات زلهێزەکان هەوڵی کڕینی دەدەن یان بەوە هەڵی دەخەڵەتێنن کۆچ بکات بۆ وولاتەکەیان یاخود فکر و دڵی لێ دەکڕێت و پاشتر دەبێتە داردەستیان و بۆ خراپەکاری لەسەر نیشتمانەکەی لە بری ئەوەی ببێتە ئامرازی چاکسازی...

دەڵێین و دەڵێین و دەڵێین....

هەموو ئەو هۆکارانەی پێشنیاری دەکەن لە دەوری مەبەستێکی دیاری کراو دەخولێتەوە، ئەو مەبەستەی هێزە جیهانیەکان کێشاویانە بۆمان و دژایەتی جێ بەجێ کردنی شەریعەتی خودای پێ دەکەن، ئایا هیچ هۆکارێکی دی هەیە جگە لە تێکۆشان؟!

ئەوانەی لە ڕێگاکە دەترسن و تۆقیوون دەڵێن چۆن بجەنگین لە کاتێکدا ئێمە بێ دەسەڵات و ژێر دەستەین؟ چۆن بجەنگین لە کاتێکدا بۆ هەر لایەك بڕۆین لە چنگیانداین؟

بەمانە دەڵێین بڕواننە تێکۆشانی ئەفغانی، ڕاپەڕینی ئیسلامی لە فەلەستین، کێ دەهات بە خەیاڵیدا یان باوەڕ دەکات کەوا گەلێکی نیمچە گۆشەگیر و دەشتەکی گەورەترین هێزی دڕندە لە مێژوودا ناچار بکات سەربازەکانی لە گۆڕپانەکە بکێشێتەوە؟!

ئەو تێکۆشانەی ئەفغان کردی ئایەتێك بوو لە ئایەتەکانی خوداو... سەلماندنێکی کرداریە بۆ ئەوەی لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ﴾[1].

سەرکەوتنی کۆمەڵێکی کەمی ئیماندار بەسەر چەندین ئەوەندەی خۆی لە هێزی بێ باوەڕ خەریك بوو دەبووە ئەفسانەیەك لە بیرکردنەوەی(موسڵمانی هاوچەرخ)دا یان بەلای زۆربەیانەوە یادی ڕۆژگارێك بوو ڕۆیشت و دووبارە نابێتەوە! کاتێك موسڵمانانی ئەم سەردەمانە لە قورئاندا ئەم ئایەتانە دەخوێننەوە: ﴿ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾[2].

﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيّٖ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٦ وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٤٧ فَـَٔاتَىٰهُمُ

---

(١) سورەتی محمد(٧).

(٢) سورەتی البقرة(٢٤٩).

ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْءَاخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾[1].

کاتێك موسڵمانی ئەم سەردەمە ئەم ئایەتانەی قورئان دەخوێنێتەوە وا هەست ناکات ئاراستەی ئەم کراوە، یاخود لەم ساتەدا مەبەستی ئەمە، بەڵکو وا دەیخوێنێتەوە کە ڕەوانەکراوە بۆ ئەو کەسانەی یەکەمجار قورئانیان بۆ هاتە خوارەوەو لە نەوەی یەکەمداو هیچ پەیوەندیەکی بە نەوەکانی هاوچەرخەوە نیە! لە هەست و دەرونیدا وەك ڕووداو گەلێکی نێو ڕۆمانێك دێتە بەرچاوی رووی داوەو ڕۆیشتووەو بە سوننەتێکی بەردەوامی نازانن، کە هەر کاتێك هۆیەکانی تێدا بێت دێتە دی!

بەڵام تێکۆشانەکەی ئەفغان ئەو بارودۆخە راستەقینەی هێنایەوە بەرچاویان، کەوا ئەمانە رێنمایی خوداییەو بۆ هەموو ئوممەت، بۆ هەموو نەوەکانیش ئاراستە کراوەو سوننەتێکی بەردەوامە، هەر کاتێك هۆیەکانی جێ بەجێ بکرێت بەدی دەهێنرێت﴿تَنصُرُواْ ٱللَّهَ﴾ داواکراوە لە ئوممەت کاتێك جێ بەجێ کرا پاداشتی خودایی بەدوای خۆی دا دەهێنێت ﴿يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾.

﴿وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾[2].

جەنگی ئەفغانسات هێشتا هەر بەردەوامی هەیەو نازانین ئەم ململانێ بەزەبرو زەنگە و زۆرەملێ یە کۆتایی دێت، بەڵام ئەوەندەی ڕوویداوە وانەیەك بوو بۆ دڵ لەرزۆکەکان و ترسنۆکەکان، وانەیە بۆ یاخی بووەکان و دوو دڵ و بەگومانەکان، لە هەمان کاتدا پاڵنەرەو وورە دەدات بە خاوەن هیمەتەکانی تێدەکۆشن.

---

(١) سورەتی ال عمران(١٤٦ — ١٤٨).

(٢) سورەتی الروم(٦).

هەروەها ڕاپەرینی فەڵەستینی لەولاوە وانەیەکی ترە لەبەر چاوماندایە، ئەو ڕاپەرینە هیچی نیە تەنها بەرد نەبێت، بەڵام گەورەترین ووزەی هەیە مرۆڤ پێی درا بێت: ئیمان.

ئەو بەردەی دەستی منداڵ و گەنجێکی تازە پێگەیشتووی ئیمانداران کردی بە چل ساڵ لە ڕاهێنان و گفتوگۆ و ووتوێژو کۆبونەوە نەیکرد کە ناو دەنرا(کۆبونەوە نێو دەوڵەتیەکان) ئەوە جگە لە کۆنگرەو کۆبونەوەکانی تر.

ئەمە هاتنەدی سوننەتێکی ترە لە سوننەتە بەردەوامەکانی خودا ئەگەر هۆکانی جێ بەجێ بکرێت. پاڵنەرێکە بۆ بەرزکردنەوەی هیمەت بۆ ئەو کەسانەی وورەو ئامادەییان هەیەو بەدوایی ڕێگاچارەدا دەگەڕێن..

پێویستە ئوممەتی ئیسلام بۆ گەڕانەوەی بنەماکانی بوونی و لەسەرووی هەموویانەوە حوکمکردن بە شەریعەتی خوداو هێنانەدی پرۆگرامی خودا تێبکۆشێت، چونکە دوژمنان هیچ شتێکی بەبێ تێکۆشان ناخەنە بەردەستی، نەزانستێکی ڕاستەقینەو بەرهەمدار، نە ئابوریەکی سەربەخۆ، نەچەك، نە هیچ شتێك.

ئەوان بەردەوام ووتوێژ دەکەن و دەیخوێننەوە پاشان هیچ شتێك نادەن بە ئوممەت تەنها ئەوە دەکەن خۆیان دەیانەوێ و بەرژەوندیەکانیان دێنێتە دی، بوونی ڕاستەقینەی ئوممەت بەدی نایەت بەڵکو ئەوان هەر نایانەوێ بمێنێ!

تاکە ڕێگا بۆ ئەوەی بوونی ئوممەت بەو شێوەیە دەیەوێت لە بوونی سیاسیی و بوونی ئابوری و بوونی شارستانی و بوونی زانستی و هەموو

پێکهاتەکان دا بیهێنێتەدی تێکۆشانە.

هیچ شتێك لە ماوەی شەو رۆژێك دا نایەتەدی و رێگاو کارەکە دوورو درێژە، چونکە ئەو ماوەیەی ئوممەت دوورکەوتۆتەوە لە رێگەی خوداو دەبێت دووبارە بگەرێتەوە سەر شوێنی لادانەکەی... زۆر دوورەو ئەو کات و هەوڵەی دەیەوێت کەم نیە و بەڵام کارێکە هەر دەبێت بکرێت و چاری تری نیە..

پێویستە خۆمان بۆ تێکۆشانێکی درێژ خایەن ئامادە بکەین... پێویستە بە گیانێکی تێکۆشەرانەوە زانست وەربگرین و کار بکەین و بژین، لە هەموو ساتێکدا لە مێشکماندا ئامانجێکی گەورە دابنێین ئەوەی وویستمانە بەدی بهێنین و کاری بۆ بکەین، بەم گیانەوە دووبارە ئوممەتەکان لە دایك دەبنەوەو رێگەی سەرکەوتن و بەرەوپێش چوون دەگرنەبەر.

دەبێت نەوەیەکی راستەقینەو کۆششکار پەروەردە بکەین لەسەر نێوچەوانیان دوو بڵێسەی پیرۆزیان هەڵگرتبێت: چرای ئیمان و چرای تێکۆشان.

کاتێك ئەم نەوە هاتە دنیاوە ماڤی ئەوەی هەیە خودا سەرکەوتن لەسەر دەستیاندا بدات و سوننەتە بەردەوامەکانی و بەڵێنە تایبەتەکەی بۆ ئەم ـوممەتە بهێنێتەدی:﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ

﴿وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ﴾[1].

دوای له دایك بوونی ئەم نەوەیه، كه به گیانی تێكۆشانەوە دەژی له هەموو ساتێكدا ئەوا یان دەبینێت رێگاكه له بەردەمیدا والایه ئامانجەكانی به تێكۆشانێكی ماندووانەی بەردەوام جێ بەجێ دەكات یاخود دەبینێت رێگاكه داخراوه به جەنگ والا دەكات...

له هەردوو بارەكەیدا یەكێك له﴿ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ﴾ دەبێته بەشی:

﴿قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ﴾[2].

بەم شێوەیه جێ بەجێ كردنی شەریعەت دەبێت به واقیع.. ئەو كۆسپانه دەبنه خەیالاتی پرووپوچ!

---

(١) سورەتی النور(٥٥).

(٢) سورەتی التوبة(٥٢).

# لە کۆتاییدا

دوای ئەوەی دەربارەی ئەو گومان و وەهمانەی سەبارەت بە جێ بەجێکردنی شەریعەت وژێنراوە دواین، بۆمان روون بویەوە کە سەرچاوەکەی لە لای خۆمان دروست نەبووەو لە ئەزموونی خودی خۆمانەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو چەند بیرۆکەیەکە هێرشی فکری لە ژیانماندا دروستی کردووە، تاوەکو ئێمە دوور بخاتەوەو ماوەی نێوان ئێمە لە گەڕانەوەماندا بۆ لای شەریعەتی خودا زۆر دوور بخاتەوە، هەر چۆن پەلامارو هێرشەکانی خاچ پەرست لێی داماڵیین و لێی سەندینەوە.

ئەوانەشی پەیوەستن بەو بنەمایەی کە ناکرێ شەریعەت جێ بەجێ بکرێت تەنها چەند لەمپەرو کۆسپێکی دەستکردەو لە پێشیاندا داینراوە تاوەکو هەوڵ نەدەین، بەڵکو تەنانەت بیریشی لێ نەکەینەوە..

زۆرجار وەهم و گومان لە دەروونی خەڵکدا گەورە دەکرێت تا دەبێت بەڕاستی لەلای، ڕەوا و حەق دەبن بە خەیاڵ و ئەندێشەیەکی دوور، پێویستی بە هەوڵی زۆر دەبێت تا لە شوێنی وەهم و گومانەکاندا دابنرێتەوە.

سەیر لەوەدا نیە دوژمنانمان هەوڵی دروستکردنی گومان و دوودڵیمان دەدەن، چونکە ئەمە کارو پیشەی بەردەوامیان بووە لەو کاتەوەی ئەم ئایینە هاتووە، بەڵکو سەیر لەوەدایە لەو گومان و دوو دڵ کردنەدا(موسڵمانان)ێك کە ناوی ئیسلامیان هەڵگرتووەو بەدەمی خۆیان دەڵێن(لا اله الا الله) شوێنیان دەکەون.

بە هەر هۆکارێك بێت کە ئەم هەڵوێستەیان هەیە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە چ کارێکی گران و ماندووبونێك کەوتۆتە سەر ئەستۆی ئێمە لەبەرانبەر ئەم بارودۆخەدا.

ئەگەر خەڵك لەسەر تێگەیشتنی ڕاستەقینەیان بمانایەتەوەو پەیڕەوکردنێکی تەواویان بۆ داواو تەواوکاریەکانی ئیمان بکردایە ئەوا ئەم گومانانە نەیاندەتوانی بووروژێندرێت و، هێرشی فیکری ئاوا دەست وەربداتە ژیانی خەڵك.

ئێستا بارگرانیەکە دەکەوێتە سەرشانی بانگخوازان... ئەوان لە توانایاندایە ڕاستی ئەو بارودۆخەی ئوممەتی تێ کەوتووە بزانن و چارەسەری بۆ دابنێن.

هەر چۆن بانگەواز تەنها بە چەند وانەو ووتارێك یان تەنها چەند ئامۆژگاریەك بدرێت بەگوێ خەڵکدا نابڕێتەوە ڕاستە هەموو ئەمانە پێویست و بەسوودن بۆ بانگەواز بەڵام -بە تەنها- هیچ شتێك لە باری ڕاستەقینەی بارودۆخەکە ناگۆڕێت.

بەڵکو بانگەواز پێشەنگی و پەروەردەیە پێش ئەوەی ئامۆژگاری و وانەو ووتار بێت.

ئەمەیە کە دەبێت بانگخوازان زۆر بە چاکی بیزانن، ئەگەر خوازیاری گۆڕانکاری ڕاستەقینەی واقیعی ئەم ئومەتە بن و سەر لەنوێ بیگەڕێننەوە بۆ کاری تەواو و بەڕاستیان بێت.

کاتێك بانگخواز کاری سەرەکی خۆی زانی بێگومان بەشێکی ڕوونکردنەوەی ڕاستێتی یەکتاپەرستی دەبێت، ئەویش پەرستنی خودایە بە تەنهاو بەبێ هاوبەش، هەروەها ژیانێك دادەمەزرێنین بەپێی داواکاریەکانی پرۆگرامی خودایی (لەنێو ئەوەشدا جێ بەجێکردنی شەریعەتی خودا) وازهێنان و وەلانانی هەموو خودایەکی دروست کراو کە لە ڕێگەی یەکتاپەرستی بێگەردا دەوەستێت لەنێو ئەو بانگەشە نەفامیانەی لەم سەردەمەدا بۆ سارد کردنەوەی بەندەکان بەکاردەهێنرێت لە پەرستنی خودا وەك ئەوەی جارێك لەژێر ناوی پەرەسەندن دا(التطور)، جارێکی دی بەناوی ژیارو شارستانیەت و جارێکی دی

بەناوی زانست و بە ناوی شۆڕشی پیشەسازی و بە ناوی ڕای گشتی جیهانی بە چەندەها ناوی تر...

بێ گومان لایەنێکی تری ئەرکەکەیان تێگەیاندن و فێرکردنی لاوانە لە میانەی پێشەنگ و پەروەردەوە کە ئیمان(ووتەو کردارە). ئیمان یەك ووشە یان وویژدانێکی شاراوە نیە لە نێو ویژدان دا. تەنها چەمکێکی فیکری نیە بووترێتەوە.

بەڵکو ووشەو ویژدان و چەمکی فیکری یەو هەمووی وەردەگێڕێتە سەر هەڵس و کەوتی واقیعی بینراو، واقعێك دەروون لە ناوەوە دەگۆڕێت و هەموو ژیانی واقیعی پێ دەگۆڕێت، بەپێی پرۆگرامی خودا لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەوە(صلی الله علیه وسلم) دایدەڕێژێتەوە.

لە عائیشەیان (ڕەزای خوای لێ بێ) پرسی سەبارەت بە ڕەوشتی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، وتی:(کان خُلقه القران) (١) .

(هەموو هەڵس و کەوت و ڕەوشتی قورئان بوو).

بەم ڕاستیە گەورەیە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ژیاو هاوەڵەکانی(ڕەزای خوایان لێ بێ) پەروەردە کراو زەوییان گۆڕی و باشترین ئوممەت لە بوون دا هاتە ئاراوە لەسەر زەوی.

مرۆڤایەتی سەر لێشێواو لە ئەمڕۆدا لەگەڵ ئەوەی خاوەنی ئەو هەموو زانست و شارستانیەت و تەکنەلۆژیایە، تا ئەوپەڕی پێویستی بەم گۆڕانکاریەیە تاوەکو جارێکی دی بگەڕێتەوە سەر ڕاستە ڕێگاکەی و، بگەڕێتەوە بۆ پەرستنی خوداو دوورکەوتنەوە لە شەیتان و، ئەو زانست و شارستانیەت و تەکنەلۆژیایەی خودا پێی داوەو دەرووی لێ کردۆتەوە بیخاتە خزمەت ئەو

---

(١) اخرجه مسلم.

ئەرکە گەورەیەی کەخودا لە پێناویدا هێناویەتیە بوون؛

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾(١).

﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ﴾(٢).

ئەو بانگخوازانەی ئەم ئەرکە زۆرو گەورەیە دەکەوێتە ئەستۆیان لەوانەی پێویستیانەو دەبێت بیکەن ئەوەیە ببن بە پێشەنگ بۆ خەڵك لەو شتانەی خەڵك بانگ دەکەن بۆی و، ئاییتەکە لە چوارچێوەیەکی کشتگیردا پەیڕەو بکات، تاوەکو بە شێوەیەکی ڕاست و تێرو تەواو بۆ خەڵکی بخاتە ڕوو، هەروەها هەوڵ بدەن بنەمایەکی پتەو دروست بکەن کە بتوانێت ئەم ئەرکە هەڵبگرێت و بەجوانی بەڕێوەبچێت.

ئیتر سەرکەوتن لەلای خودایە.

گومانی ناتوانرێ شەریعەت جێ بەجێ بکرێت بەهۆی بوونی کەمە نەتەوە ناموسڵمانەکانەوە.

---

(١) سورەتی الذاریات(٥٦).

(٢) سورەتی الانعام(١٦٢ — ١٦٣).

# ناوەڕۆک

هەر كاتێ باس لە جێ بەجێكردنی شەریعەت بكرێ، لێرەو لەوێ دەنگی نارەزایەتی بەرز دەبێتەوەو، دەیكەنە هەراو رەتی دەكەنەوە، وەك ئەوەی جێ بەجێكردنی شەریعەت كارەسات و بەڵایەك بێت و وڵاتی موسڵمانان بگرێتەوە، یان وەك ئەوەی بیركردنەوە لەو كارە، كارێكی گێلانە بێت و بە مێشكی هیچ كەسێكی عاقڵدا نەیەت!

ئێستا، لە سەدەی بیستدا، پاش ئەو هەموو پێشكەوتنانەی جیهان بەخۆیەوە بینی، دوای ئەوەی بەهۆی هۆكارە نوێیەكانی گەیاندنەوە ، جیهان بووە گوندێكی بچوك، بواری ئەوە نیە بریاری پۆشینی كاڵایەكی جیاواز لە كاڵای ئەوانی دیكە بدەیت؟! ئایا دەتانەوێت خۆمان لەو خەڵكە جیابكەینەوە؟! دەتانەوێت بەرەوپاش بگەرێینەوە؟ یان رەورەوەی پێشكەوتن رابگرین؟! یاخود دەمانەوێت لەهەموو جیهان دابېرێین و بەسەر خۆماندا بكەوین؟...

ئەم هەموو ماندووبونە بۆ؟ چی وامان لێدەكات بەرەو ئەو رێگە دژوارە برۆین؟...


بڵاوكراوەی نووسینگەی
نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com


COVER DESIGN